ستیڤان بروشفیلد
پول ئا. لیڤین

# هولۆکۆست

# ئاگاداری نەوەکانتی پێ بکەنەوە



وەرگێڕانی
لە عەرەبییەوە
شێرزاد هەینی



هۆلۆکۆست

# ئاگاداری نەوەکانتانی پێ بکەنەوە

کتێبەکە لە سەر قڕکردن
لە ساڵانی 1933ـ 1945 لە ئەوروپادا.

ستیڤان برۆشفیلد
پۆل ئا. لیڤین

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە
شێرزاد هەینی

چاپی 2007
هەولێر



لەبڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکریی و ئەدەبی نما
زنجیرەی( 69 )
سەرپەرشتیکردنی پرۆژەی چاپی کتێب
ئیسماعیل کوردە، رێبین رەسوڵ ئیسماعیل

**ناوی کتێب: ئاگاداری نەوەکانتانی پێ بکەنەوە**

نوسینی:
ستیڤان بروشفیلد
پۆل ئا. لیڤین

و: شێرزاد هەینی
نەخشەسازی: نما
بەرگ: ئارام
تیراژ: 500 دانە
چاپ: چاپخانەی تیشک
کوردستان/ هەولێر 2007

**وتەیەکی کورت :**

ئەم کتێبە بە ناوی ئاگاداری ئەوەکانتانی پێ بکەنەوە.

لە لایەن حکومەتی سویدی و لە سەر داوای پەرلەمانی سوید بە چەند زمان بلاو کرایەوە. ئەم کتێبە تیراژی سویدیەکەی ئەوەندە زۆر بوو، لە هەر پۆلێك، لە هەر دەزگایەك، لە کتێبخانەکان لە شوێنە گشتیەکان، ژمارەی زۆر دانراوە و بە پۆست و بە خۆرایش بۆ هەر کەسێك داوای کردبایە بۆیان رەوانە دەکرد.

ئەم کتێبە بە وێنەی جەرگبڕەوە کارەساتی سوتاندن و قڕکردنی جولەکەیە لە ئەوروپایە بە دەست نازییەکان بلاوکراوەتەوە.

وێنە و شێوەی کوشتنەکان، راگوێزان و زەوتکردنی سامان و ژانەکان لە ژان و ئەنفال و سوتماکی خاکی کوردستان دەچێت، کە بە دەست بەعسیەکان و داگیرکەرانی کوردستان بەردەوام پەیرەوییان کرد.

شێرزاد هەینی

هەولێر 2005/5/16

له كاتی گفتوگۆی سەرۆك حیزبەكان له یونیو 1 حوزیرانی 1997. سەرۆكی حكومەت یوران پیرشون پێشنیاری كرد بۆ ئەنجامدانی هەڵمەتێكی راگەیاندنی بەر بڵاو لە سەر ڤرکردن بە ناوی" بەسەرهاتە زیندووەكان levande historia".

نیازەكە ئەوە بوو ڤرکردنەكەی ماوەی شەڕی جیهانی دووەم بكرێتە خاڵی دەرباز بوون بۆ باسكردنی بابەتی هاوكاری مرۆڤایەتی و دیموكراسی و یەكسانی.

دەست پێشخەری (( بە سەرهاتە زیندووەكان)) چەندین چالاكی سیاسییە، زانیارییە بۆ دایك و باوك و بۆ سەرجەم كۆمەڵانی خەڵكە. بەشدار بوونی تایبەتكراوە بۆ خوێندنگاكان و جەخت له سەر زانكۆكان و توژینەوەكان بكرێت.

ئەم كتێبە یەكێكە لە چالاكیەكانی (( بە سەرهاتە زیندووەكان )) كەوا بە تایبەتی ئاراستەی گەورەكان كراوە.

**پێشەکی:**

حکومەت داوای لێکردین ئەم کتێبە دەربکەین تا ببێتە بەشێك لە دەست پێشخەریەك بۆ (( بەسەرهاتە زیندووەکان )). دانانی کتێبێك لە سەر بابەتێکی گران و هەم لایەن وەك قڕکردن بە ماوەیەکی کورت کارێکی ئاسان نیە.

لە بەر بڕوابوونمان بە گرنگی نیشاندان و پێشکەشکردنی بابەتی قڕکردن بە شێوەیەکی دروست ئەم کارەمان وەرگرت. زانیاری لە سەر قڕکردن شتێك نیە بتوانرێت بە شێوەی پڕوپاگەندە یان وەك نەریتەکانی پیشەیی چارەسەر بکرێت. هەڵسەنگاندنیش دەگەڕێتەوە لای خەڵکانیتر کەوا بڕیار لە سەر سەرکەوتنی کارەکانمان بدەن. کۆششمان کرد بۆ ناوێتەکردنی بابەتە زانیاریەکان بە دەنگی کەسەکان.

ناچار بووین چەندین بڕیاری قورس بدەین، کارێکی بەژانە کەوا لە ناو چەندین دەنگ و سیما بژاریَ بکەین و لێیان ورد بینەوە. خەڵك زۆر لە سەر قڕکردن دەزانن، بابەتەکە لە مێژە بە تێری باس کراوە. ڕێگا بۆ نوشفیتز پڕۆپاگەندی ڕقایەتی دەگۆڕێت بۆ مەسەلەی پۆلکردنی ئادەمیزاد و جیاکردنەوەو دوورخستنەوەیان و لە کۆتاییشدا بۆ لە ناو بردنی جەستەییان لەو نۆردوگایانەی بۆ ئەم مەبەستە دروستکراون. ئەستەمە بتوانرێت ئەو زیانانە دەست نیشان بکرێت کەوا لە ئەنجامی بۆ جوونی نازییەکان بۆ دامەزراندنی ئەڵمانیای گەورەی خاوەن ((ڕەگەزی بێگەرد)) ، بەڵام قەوارەکە روونە. قوربانیەکانی قڕکردنە بە بەرنامەکە گەیشتە 6 ـ 5 ملیون جولەکە و نزیکەی نیو ملیون قەرەج و ژمارەی سەد هەزار کەس و هەروەها شاهیدی بەهاو چەند ملیون مەدەنی پۆڵۆنی و گیراوی شەڕی سۆڤیەت. بەڵام ئەو ژمارانە چی دەگەیەنن؟ لە بەر ئەوەی ژمارەی دەرەی زۆرە بۆیە مانایان نامێنێ، دوایش ئاسان نیە مانایە ڕاستەقینەکەی لە بیر بکرێت. بۆیە پێویستە مرۆڤ کۆششی ئەوە بکات کەوا لە پشت هەر دەرەیەك ناوێك ، دامەزراوەیەك، کەسێك دڵسۆزی هەبێ، دوارۆژی بە فیڕۆ چوو، مناڵ ، دایك و باوك و خزم. بۆیە ئێمە لە لاپەرەی داهاتوودا دەست بە باسکردنی

منداڵەکانی (( بولنهوزردام)) دەکەین، چیرۆکێکە کۆتایەکەی خەمناکییە. بەداخەوە سیمای قڕکردن وایە، نازییەکان لە شەڕەکەدا یەك ملیون و نیو منداڵی جولەکەیان کوشت، لە نۆ منداڵی جولەکە لە ئەوروپا نۆیان گیانیان لە دەست دا. پرسیارەکەش ئەوەیە چۆن کرا؟هیوامان وایە ئەم کتێبە هاوکاریێ بێ بۆ رووناك کردنی لایەنی قڕکردن لە سوید، هەروەها ببێتە خاڵی دەرچوون بۆ گفتوگۆ لە سەر رەوشت و دیموکراسی و نەریتەکان و بنەماکانی مرۆڤایەتی لە نێوان باوك و منداڵەکانیان، نەك هەر بۆ ئەو سەردەمە و بەس بەڵکو بۆ دوارۆژیش. بەڵام کتێبەکە هەر ئەوەندە ببێتە سەرەتایەك بۆ ئەوانەی بایەخی پێدەدەن. ئەو زانیاریانەی کە تێدایە بەشێکی کەمە لە ساڵە ترسناکەکانی شەڕی جیهانی دووەم. ئێمە تەنیا رووەکەی دەبزوێنین و بەس ، بۆیە داواکارین هەموو خوێنەران خۆیان کۆشش بکەن و خۆیان بۆی بگەڕێن.

لە کۆتاییدا ئەوە بە هەل دەزانین سوپاس پێشکەش بەو هەموو کەسانە بکەین کە یارمەتیان داین بۆ دانانی ئەم کتێبە لە ماوەی دەرچوونی بە ماوەیەکی کورت. چونکە بێ یارمەتی ئەوان نەدەکرا، ئەرکی زۆرتر لە پێویستیان کێشا بۆ تەواو کردنی ئەم پرۆژەیە Bokförlaget nature och kultur ، ئەوانیش ، لینا ئالبین دەزگای پەخشی. ئەنا ـ کارین یوهانسون( بەرپرسی پرۆژەکە و کارکەر لە بەشی راگەیاندن لە بارەگای حکومەت لە روزنباد)، سانا یوهانسون ( وێنەکان). یاکوب ڤیجیلیون( نەخشە و نیگارەکان ). ئەلسا ڤولفارت (( نەخشەسازی بەرگەکە )) ، ماریتا زونابند و ئیڤانوکربیری (( وەرگێران ). سوپاسی یارمەتی ئەنیتا کارب و میالوڤنجارت دەکەم، کە لە زۆر بواردا یارمەتیان داوین و بەبێ ئەو یارمەتیانە ئەم کتێبە تەواو نەدەبوو.

ستۆکۆلم لەینایەد / کانونی دووەمی1998

ستیڤان بروشفیلد و پول. ئا. لیڤین.

*مەبەست لە وشەی قڕکردن لەم دەقەدا قڕکردنی بە کۆمەڵی جولەکەیە لە ماوەی شەڕی جیهانی دووەمدا بە دەستی نازییەکان لە ئەڵمانیا لە سەردەمی هتلردا.

## منالآن ئازەڵی تاقیکردنەوەی تاقیگەکانن:

لە نیسانی 1945 دا هێزەکانی هاوپەیمانان هێرشیان گەیشتە ناو خاکی ئەڵمانی نازیی، بەڵام ئەڵمانیا تا 8 ی / مایو/ ئەیاری هەمان ساڵ دەستی نەدا. سەرەڕای ئەوەش شارەزاکانی روودانی تاوانەکان ئەوەی لە دەستیان هات بەڵگەنامەکانیان فەوتاند و راستییەکانیان سەروژێر کرد.

لە کاتژمێری 8ی ئێوارەی رۆژی 20ی ئەبریل/ نیسان کەوا هەمان رۆژ بوو کە دوا یادی لە دایکبوونی هتلر کرا. ئوردوگای گرتنی نیونگام Neuengamne هەڵکەوتوو لە دەرەوەی شاری هامبۆرگ گیراوە ئەسکەندنافیەکان بە پاسی سپی چۆڵکرا. لە ئوردوگاکەدا 20 منالی جولەکەی تەمەن 12. 5 ساڵ هەبوون، دەیان کیژ و دەیان کوڕ بوون، لەوانە چواریان خوشك و برا بوون . ئەوان بۆ رزگار بوون نەبوون. ئەوانە بۆ نموونەی تاقیکردنەوە هەڵگیرا بوون. چەند مانگ بوو دکتۆری SS کورت هایسمایر ئەنجامی دەدا. چەندین ئەشتەرگەرییان بۆ منالآن کرد بوو بۆ دەرهێنانی گرێ لمفاوییان لە جەستە یان و دەرزی وەرەم ((سیل))ی زیندوویان لە پشتیان دەدە. بکتریا ئەم نەخۆشیەیان راستەوخۆ بە بۆرییەك لە سیپەکانیان دەکردن. هایسمایر لە لێپرسینەوەی ساڵی 1964 دا لە گەڵی ئەنجام درابوو وتبوی (( من هیچ جیاوازی مەبدەئیم لە نێوان جولەکە و ئاژەڵەکانی تاقیکردنەوەدا هەست پێنەکردووە )).

پاش چەند سەعاتێك منالەکان و چوار گیراوە گەورەکەی کە چاوی لێیان دەبوو گواسترانەوە بینایەی خوێندنگایەکی گەورە لە هامبۆرگ پێش نیوەی شەو گەیشتن. چوار گەورەکە دوو دکتۆری فرنساوی (( گابریل فلورنس و رینیە کونیویلە و دووانەکەی تریش هۆلەندی بوون ئەوانیش دیرك دیوتیکو و ئەنتۆن هولزل )) بوون. خوێندنگاکەی ئەو دەستەیەی بۆ رەوانە کرا ناوی بولینهاوزر بوو و چەند مانگێك بوو کرابووە پاشکۆیەکی گرتوخانەکە و بۆ کۆکردنەوەی ئەو ئەسکندنافیانە بوو کە نیازیان بوو ئازادیان بکەن.

دەستەکە راپێچی ژێر زەمینەکە کران، لە ژووری سوتانی سوتەمەنیدا بۆ گەرمکردنەوە گەورەکانیان بە بۆرییەك بە بنمیچەکەیان هەڵواسین ، دوایش

مناڵـەکان هەنـــدێکیان دەرزی مۆرفینیـــان لێ درابـــوو یـــەکێکیان شـــرپبوو نـــاوی جـورجیس ئەندریە کوهن بـوو. بە پێی ناخـاوتنی دکتـۆری ئـەس ئـەس ئـەلفرد ترزبنـسکی یەکـەم جـار جـۆرجیس بـە خـەوتووی لـە سـێدارە درا. ئـەو بـە دیـوار هەڵواسـرا وەك ئـەوانیتر نـەبوو کـە بـە بۆرییەکـە هەڵواسـران، عـەریفی تایبـەتی ئەس ئەس یوهان فرام بە هەموو هێزیکەوە توندی دەگردن.

مناڵـەکان دوو دوو وەك تـابلۆ هەڵدەواسـران، ئـەوانی لـە لێپرسـینەوەکەی سـاڵی 1946 دا دوانیان دا بوو وتبویان هیچ لە مناڵەکان فرمێسکیان لە چـاوان نەهاتـە خوارێ. بە مردنی مناڵەکان پێکی شادی هەڵدرا و جگەرە بە سەر پیاوانی ئـەس ئەس دابەشکرا و دوای ئەوان نۆرەی بیست گیراوی سۆڤیەتی هات، ناویان نـەزانرا. بـەڵام نـاوی مناڵـەکان وا بـوو(( مانیـا ئـەلتمان 5 سـاڵە.لیلکابیرنبـاوم 12 سـاڵ و سرکیس گولدینگر 11 ساڵ. ریڤیکاهیرزبرگ 7ساڵ. ئەلکسندر هورنمـان 8 سـاڵ. ئەدوارد هورنمان 12 ساڵ. لیاکلیجرمـان 8 سـاڵ. جـورجیس ئەندریـە کوهن 12 ساڵ. بلومـل مکلر 11 ساڵ. جاکلین مورجنـستیرن 12 سـاڵ. ئـەدوارد رایشنباوم 15 ساڵ. سیرجیودی سیمون 7 سـاڵ. ماریـك ستـاینباوم15 سـاڵ. هـ‌ڤاسـرمان 8 ساڵ. ئەليناور ڤيتونسكا 5 ساڵ. رومان ڤیتونسکی 7 ساڵ. رومـان زیلـر 12 سـاڵ. روشلا زیلبرباری 9 ساڵ.

بۆ رۆژی دوایی تەرمەکانیان بۆ نوینگلم رامالران بۆ سوتاندن. ئێستا خوێندنگاکە ناوی یانوس کورزاك شولەیە و لە حەوشەی خوێندنگاکە گوڵی بچوك راگیراون بۆ بیرەوەری مناڵەکان.

لە 17/ ئوگست/ ئابدا بـاوکی منـاڵ جـورجیس ئەندریـە و خێزانـەکەی لـە شـاری پاریس بۆ ئوشفیتز دووز خرابۆوە، ئەوەش کاروانی ژمارە (27)ەمینـی جولەکـەی فرنـساوی بـوو کـە دوور خرابوونـەوە و یەکێکـە لـە دوا کـاروانی دوور خـراوەی جولەکـەی فرنـساوی بـوو. بـە گەیـشتنی جـورجیس ئەندریـە بـۆ ئوشـفیتز بـۆ تاقیگـەی تەندروسـتی هەڵبـژێردراو لـە کۆتاییـەکانی نـوڤمبر/ تـشرینی دووەم گواسترایەوە نوردوگای نوینگام.

**پێشەكی:**

ناتوانرێت مێژووی نازییەكانی ئەڵمانیا لە نازییەكانی جیهان جیا بكرێتەوە، فڕكردن لە بیرەكانی ئایدلۆژی رەگەزپەرستی ئودۆلف هتلر سەرچاوەی گرتووە كە لە كتێبەكەی (( خەبتم Mein Kampf )) روونە. نە هتلر و نە حیزبە نازییەكەی بۆیان نەدەكرا نكۆڵی لەوە بكەن كە دژایەتی كۆمەڵگای دیموكراسی و بەهاكانین. لە لای ئەوان (( رەگەز )) لە پێش هەموو شتێك بووە.

هیچ بەهایەكیان بۆ مرۆڤ بێجگە لەوەی كە مرۆڤ دار دەستی بێ بۆ ئامێری دەوڵەتی رەگەزپەرستیان بێ دادەنا. بە وەرگرتنی دەسەڵات لە 30/ینایر/كانوونی دووەم 1933 لە لایەن نازییەكان یەكسەر ئەم ئایدلۆژیانەیان پەیرەو كرد.



## پێشینەكانی هزری ڕەگەزپەرستی

هزری ڕەگەزپەرستی لە ئەوروپادا لە مێژە ڕەگی داكوتاوە و گەشەی كردووە، ڕووناكبیران و فەیلەسوفەكانی سەدەی حەڤدەیەم پێشبینی جۆرەها ڕەگەزی مرۆڤیان كرد بوو. لە ساڵی 1854دا دبلوماسی فرنساوی ئەرتور دوجوبینو كتێبێكی بە كاریگەری زۆری لە ژێر ناوی (( نایەكسانی لە نێوان ڕەگەزكانی مرۆڤدا )) بلاو كردەوە و پێشبینی ئەوەی كردبوو كەوا ڕەگەز (( ئاری )) خۆی بە زلتر و شكۆتر ڕەگەز دەزانی، هەروەها هەرە شەشی لە (( ناوێتە بوونی ڕەگەزی )) لە گەڵ (( بێجگە لە ئاری )) لەوانەی بە هەمان پلە گەشەیان نەكردووە دەگرد. ئەم بۆچوونەش لە لایەن توندرەوە ئوروپاییەكان و ئیمپریالیزمەكان كاریگەری زۆری هەبوو. لە بەر ڕۆشنایی بیردۆزی گەشەسەندنی سروشتی تشارلس داروین كە دەڵێت (( ئەو كەسەی زۆرتر خۆی بگونجێنێ ئەو دەمێنێ )) پاشان پیاوانی هزر و ڕۆشنفكران ئیشیان بۆ چەسپاندنی ئەم هزرە لە كۆمەڵگا كرد. بیردۆزەكەی داروینی كۆمەڵایەتی كەوا ناسرابوو چەندین بۆچوونی دەگرتەوە كە پوختەكەی وایە بۆ (( بە هێزەكان )) ڕەوایە بڕیار لە سەر (( لاوازەكان )) بدەن. ڕووناكبیری ئەڵمانی . ئینگلیزی هـ.س.شامبرلین H.S.Chamberlain لە ساڵی 1899دا بیرۆكەی ئەوەی كەوا (( ڕەگەزی ئاری )) كەوا میتال جرمانس سەردەستەیەتی دەتوانێ ئایینی كریستیان و شارستانی ئەورویی لە ترسی دوژمنی جولەكە ڕزگار بكات.

## بەرهەڵەست كردنی سامیەت و بایولۆژی ڕەگەزی

جولەكە لە چاخەكانی ناوەڕاستەوە لە ئەوروپا ژیاون، لە سەرەتاكانی سەدەكانی ناوەڕاستەوە كەنیسە جولەكەیان بەوە تاوانبار كرد كەوا ئەوان یەسوعیا كوشتوە و بەوەش تاوانبار كران كەوا یەسوع بە مەسیح نازانن. ئەم بۆچوونە ڕەوشتی جولەكەی بەرەو خراپی برد و لە چەند سەدەی ڕابردوودا هێرشی توند و كۆمەڵكوژییان دەرحەق كراوە. بە هەڵكردنی باهۆزی دیموكراسیەتی شۆرشی

1789

فرنسا لە ساڵی 1798 ڕەوشەکەیان کەمێ هێور بۆوە و دەروازەی چاکبوونی ڕەوشی جولەکە کرایەوە و وای لێهات بەدانی ئازادی جولەکە ناو ببرێت لە چەرخی نۆزدەهەم تونیان وەك مرۆڤ ئاسایی بەشداری کۆمەڵ بکەن. لە کۆتاییەکانی چەرخی نۆزدەهەم شێوەی نوێی دژایەتیکردنی جولەکە سەری هەڵدا (( دژایەتیکردنی سامیەت )) کاردانەوەی لە سەر دەرکردنی ئازادییەکان هەبوو. دژایەتیکردنی سامیەت بووە چەکێکی سیاسی، لە ڕۆژانی قەیرانە روحیەکان و ئابوورییەکان و سیاسییەکاندا پەنجەی تاوانیان ئاراستە دەکرا کەوا جولەکە کاریگەری زۆریان لە سەر کۆمەڵگە هەیە و جولەکەش بەوە تاوانبار دەکران کەوا پیلانیان هەیە بۆ وەرگرتنی دەستەڵاتی هەموو جیهان.

لەو ماوەیەدا زانستی هاوچەرخ مۆرکی بیرۆکەکانی ئاروینی کۆمەڵایەتی پێوە نووسا و سیمای ناسراو بە ئەیوجینك وەرگرت (( هەموو پێویستیەکانی بکرێت تا کەماسی زگماکیبوون لە ناوك ـ ئاوڵەمە ـ نەبێت )) هەروەها باس لە پارێزگاری ڕەگەزی بێگەرد کرا. خاوەنی ئەم جۆرە بیردۆزانە دەیان ووت کۆمەڵگە لە لایەن ناوکی بوونی بێکەڵك (( لاوازی هەرەشەی لێدەکات و دەیان ووت دەکرێ پاراستن و چاککردنی جۆری (( تەندروستی)) کۆمەڵ بکرێت بە قەدەغەکردنی ئەو ناوکانە لە زۆر بوون و بڵاو بوونەوە. بۆچوونەکانی ئەم بزافە لە چەرخی بیستەم لە ئەورووپا و ولایەتەیەکگرتووەکان بە نەزۆککردنی ژمارەیەکی زۆری ژنان جێبەجێ کرا.

لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهاندا 1914-1918دا ڕوون بۆوە کەوا کۆمەڵگای پیشەسازی دەتوانێ کۆمەڵکوژی بکات و زۆر لە شەرکەرە دێرینەکانی حیزبی نازی و بینەرانی کارەساتەکە و شکان و نسکۆی ئەڵمانیا جولەکەیان پێی تاوانبار دەکرد، ویستو هاندەر بوو بۆ تۆڵەسەندن، نازییەکان وتیان پێویستە ئەڵمانیا رزگار بکەین و لە سەر نوێ لە دایك بێتەوە ئەوەش بە پەیرەوکردنی سیاسەتی زانستی بایولوجی ڕەگەزی و بە پارێزگاری ناوکی بوونی بێگەرد و دژ بە سامیەت، ئامانجی (( ڕەگەزی بێگەرد ))و کۆمەڵگای هاوشان کە جیاوازییەکانی (( سروشت لە نێوان مرۆڤدا جێگای ڕێز و ستایش بێ )).

یاساکانی نورنیبرگ پڕ بە پێستی بیردۆزەکان بوو، ئەو یاسایە جولەکەی گرتەوە و دوایش قەرەج. تەنیا بۆ (( هاوڵاتی خاوەن خوێن ئەڵمانی یان ئەوانەی پەیوەندییان پێوە هەیە)) ڕەوایە مافی تەواوی هاوڵاتی پیادە بکەن، دوایی زانایانی یاسا و پارێزەران ئەوەشیان خستە پاڵی کە دەڵێ (( لە دژی هەموو یاساکان کە دەڵێ هەموو مرۆڤ یەکسانن ...... سوشیالیستی نەتەوەیی ڕێنمایی توندی پێویستی لە مەڕ جیاوازییەکانی بنچینەیی مرۆڤدا دانا .......)).

ئەوەی هۆکاری بنچینەیی ئایدلۆژی و دەروونی و تەکنەلۆژیی بۆ قڕکردنی دارشت و لە نێوان ساڵانی 1933- 1945 دا بە پێی ئایدلۆژی هتلر و نازیەت پرۆسەکانی کوشتن و قڕکردنی بە کۆمەڵ دژ بە جولەکە و قەرەج جێبەجێ کرا. لەوە زۆرتر جێگای بڕوا کردن نیە بۆ دەست بە سەر گرتنی ڕەگەزیەکی تر. ئەو مرۆڤەی کە بە روونی هەست دەکات کەوا ڕەچەڵەکی دەگەرێتەوە سەر ڕەگەزیەکی بێگەرد و هەرگیز ئەم هۆشە گوم ناکات. ڕەگەز کەس بەرز دەکاتەوە بۆ روونکردنەوەی خود لە راستیدا. هێزێکی زۆری پێدەبەخشێ و دەتوانم بڵێم لە سەرووی سروشتەوەیە. ئەوەی کە لە کەسێتری جیا دەکاتەوە کە لە ڕەسەندا ئەویش لەم تێکەڵە مرۆییەدا بووە کە کەسانی تری هەموو گۆشەیەکی ئەم ئاوەدانیەی هاتیتە ناوی.

هـ.س.شامبیرلین. زانای ڕەگەزکانی ئەوروپی.

مەسەلەی جولەکە مەسەلەیەکی ئابووری نیە و بەس، بەڵکو مەسەلەی ڕەگەز و کێشەی شارستانیشە. جولەکایەتی کارەساتی میللەتانی ئەوروپایە.

بار ئیمانوئیل لیتاندر.بازرگان و پەرلەمانتاری سویدی 1912

ئەو گەمەیە ! Juden raus)) جولەکە بۆ دەرەوە کەوا کارگەی ئەڵمانی لە سیەکان پێشکەشی گەورە و گچکەکانیان وەك (( یاریەکی خۆش)) یان کردبوو. کڵاوی بوکەشوشەکان یارییەکە وەك ئەو کڵاوانە بوو کە جولەکە لە سەدەکانی ناوەراستدا ناچار کرا بوون لە سەریان بکەن، دەتوانی ئەم کاریکارەگەز دژ بە سامیەت لە سەر کڵاوەکە ببینیت. هەروەها ئەم نوسینەش لە سەر تابلۆکە بەدی

دەگرێت (( ئەگەر سەرکەوتیت بۆ دەرکردنی شەش جولەکە ئەوا سەرکەوتنێکی روونت بە دەست هێناوە)).

. ئەو گەنجانە فێر نابن بێجگە لەوەی وەك ئەڵمانیەك بیر بکاتەوەو بجولێتەوە، ئەو کیژ و کورانەی لە تەمەنی دە ساڵیدا لە ڕێکخراوەکەمان دەبنە ئەندام مەزندە وایە کەوا یەکەم جارە هەوای پاك هەڵدەمژن. پاش چوار ساڵ لە پێشڕەویی دێنە ناو (( هێزەکانی هتلر )) و لەوێش چوار ساڵیان دەهێڵینەوە (....) لە درێژایی ژیانیاندا سەربەست نابن.

**وتاری ئودولف هتلر لە 1938/2/2**

کورێك لە هێزەکانی هتلر کیژۆڵەیەك لە کۆلۆنێکی ئەڵمانی لە پۆلونیا. ئەم کۆلونیە دروستکراوە بە مەبەستی گەشەی (( بواری ژیان)) ی ئەڵمانی لە خۆرهەڵات. دانیشتووانە ڕاستەقینەکان دوورخرانەوەو خێزانە ئەڵمانیەکان دەستیان بە سەر کێلگەکانیان داگرت.

N° 413 SÉRIE
PRÉFECTURE D'INDRE-&-LOIRE
Carte d'Identité
Nom : HOROWITZ
Prénoms : Anny-Yolande
Né le Juin 1932
à STRASBOURG
Département du Bas Rhin
Domicile : 21, rue ... - BORDEAUX (Gironde)
Signalement :
Cheveux : blond
Yeux : bleus
à TOURS, le 4 Décembre 1940
Le Préfet,

**پسولەی ناسینی ئانی هوروڤیتز**

پاش داگیر کردنی فرنسا لە ساڵی 1940 لە لایەن ئەڵمانیەوە سەر ژمێری هەموو جولەکەکانیان کرد و ئەوەش یەکەم هەنگاو بوو بەرەو قڕکردن.

نانی هوروفیتز لە دایکبووی ستراسبۆرگە 1933، جولەکە (( بێگانەی ژێر چاودێری)) ئەوە بوو کە لە سەر پسولەی ناسنامەکەی نوسرابوو، گیراو یەکەم کەس بووە رەوانەی ئەو ئوردوگای نزیک تورز کراوەو دوایش بۆ ئوردوگای درانسی کە یەکێکە لە ناوچەکانی دەورو پشتی پاریس و لەوێشەوە لە 11/ سیپتمبەر/ ئەیلول/1942 لە کاروانی 31 لە فرنساوە بۆ ئوشفیتز دوور خرایەوە. فریدای دایک و خوشکی باولیت تەمەن 7 ساڵانی لە گەڵ چووە، ئەم گەشتە هەزار کەس پیاو و ژن و منداڵ بوو. بە گەیشتنیان 600 کەسیان ناونوسکردن لەوانە هەموو منداڵەکان بۆ ژوورەکانی گاز. نانی و باولیت دوو کەسی نزیکەی یەک ملیون و نیو منداڵە، جولەکە بوون لە ماوەی فڕکردندا کوژران. رێژەی رزگار بوونی منداڵان یەک لە دە منداڵ بوو، بواری رزگار بوونی منداڵە جولەکەکان لە هەندێ شوێندا هەر نەبوو وەک لە پۆلونیا و وڵاتانی بەلتیک.

پێویستە پەروەردەی تەواوی گەنجانی ئەڵمانی بێجگە لە خوێندنگا وماڵی دایک و باوکیان لە هێزەکانی هتلر جەستەو گیانو رەوشتیان بکرێت تا لە گەڵ گیانی سوشیالیستی نەتەوەیی بۆ خزمەتی گەل و بەرژەوەندیەکانی بگونجێ.

- (چەند برگەیەک لە دەقی یاساکەی هێزەکانی هتلر) هتلر یوگند 1935



ئەم وێنەیە لە کتێبی منداڵانی ئەڵمانی((Der Giftpiz)) ( قارچکی ژەهر) وەرگیراوە کە لە ساڵی 1938 بڵاو کراوەتەوە. دیارە کە چۆن بۆ ئەوەی خوێندنگاکان لە مامۆستا و خوێندکارانی جولەکە پاک بکرێتەوە و ببێتە (( ئاریەکی بێگەرد)).

هەروەها کتێبەکە ئەوەی روون کردیتەوە وەك چۆن زەحمەتە جیاوازی لە نێوان قارچکی ژەهراوی و ئەو قارچکە بکرێت کە دەخورێت. ئاواش زەحمەتزە جیاوازی لە نێوان جولەکە و دز و تاوانبار بکرێت.

1919 16/ سبتمبەر/ ئەیلول

هتلر دەچێتە ناو حیزبی کرێکاری ئەڵمانی (DAP)

1920 8/ ئوگست / ئاب

دامەزرانـــــدنی پـــــارتی کرێکـــــاری نەتـــــەوەیی سوشیالیـــــستی ئەڵمانیNSDAP

1923 8 ـ 9/ نۆڤمبەر/ تشرینی دووەم

کودەتـا هتلـر ویـستی حکومـەتی پـایری بروخێنـێ بـەڵام هەرەسـی هێنا.لە ئەبریل/ نیسان بۆ ماوەی 5 ساڵ حوکم درا و ئەوەش ساڵی 1924 بوو لەم زیندانەدا کتێبی ( خەباتم)Mein Kampt نووسی.

1925 نۆڤمبەر/ تشرینی دووەم

هێزەکـانی ئـەس ئـەس لـە مـونیخ دامـەزرا بـۆ ئـەوەی ببێتـە پاسـەوانی تایبـەتی هتلر.

1928 20/ مایو/ ئەیار

هەڵبژاردنی پەرلەمان ،حیزبی نازی رێژەی 2/6 لە دەنگەکان هێنا.

1930 14/ سپتمبەر/ ئەیلول

هەڵبـژاردنی پەرلـەمان. لـەو کاتـەی جیهـان لـە سـستی ئـابووری دابـوو نازییەکان رێژەی18.3٪ لە دەنگەکانی هەڵبژاردنیان وەدەست هێنا.

1931 دیسمبەر/ کانوونی یەکەم

هەڵلاسانی تەنگەژەی بێکاری لە ئەڵمانیا. ژمارەی بێکاران گەیشتە 5.6 ملیون کەس.

بەهاری 1932

هتلر دوو خول هەڵبژاردنی بۆ وەرگرتنی سەرۆکایەتی دەدۆرێنێ.

31یولیو/ تەمموز

هەڵبژاردنی پەرلەمان، پارتی نازی سەرکەوتنێکی زۆر لە هەڵبژاردنە ئازادەکە وەدەست دێنێ و نازییەکان دەبنە خاوەن گەورەترین حیزب لە ئەڵمانیا بە وەرگرتنی 37.4 ڕێژەی دەنگەکان.

6 نوفمبەر/ تشرینی دووەم

هەڵبـژاردنی پەرلـەمان. نازییـەکان پاشەکـشیان بـوو و ڕێـژەی 33.1 دەنگـەکان دەهێنن.

1933 30 نیابر/ کانوونی دووەم

ئودولـف هتلـر دەبێتـە ڕاوێـژکاری ئـەڵمانیا، یەکسەر جولەکـەکانی ئەڵمانیا هەست بسەر هەڵدانی سیاسەتی نازیەتی دژ بە جولەکە دەکەن.

20ئادار/ مارس

دانـانی یەکـەم ئوردوگـای گـرتن ئـەویش داخـاو(Dachau)ی دووری 16کـم هەڵکەوتووی باکووری ڕۆژئاوای میونیخ.

1 ـ 3 ئەبریل/ نیسان

پارێزەر و دکتورەکان نەچوونە گەرەکە جولەکە نشینەکان.

ئەبریل/ نیسان

دەرکردنی جولەکەکان لە فەرمانگە حکومییەکان.

15/ مایو/ ئەیار

دامەزراندنی سوتانگەی ئاشکرا بۆ سوتاندنی ئەو کتێبانەی نوسەرەکانیان جولەکە بوون یان دژ بە نازییەت نوسرابوون.

14/ یولیو/ تەمموز

حیزبی نەتەوەیی سوشیالیست نازی دەبێتە تاکە حیزبی مۆڵەتدراو لە ئەڵمانیاداناني ئەو یاسایانەی کەوا نەزۆککردنی بە زۆری بۆ قەرەج و جولەکە و ئەلمانیە کەم ئەندامەکان و بەدەنگەکانی دانا.

سپتمبەر/ ئەیلول

لادانی هەموو جولەکەکان لە هەموو چالاکییە ڕۆشنبیرییەکان.

(( تەواوی خشتەکاتییەکە لە لاپەرەکانی( )دایە.

## ژیانی جولەکەکان پێش شەڕ

پێش گەیشتنی نازیەت و وەرگرتنی دەسەڵات جولەکە لە هەموو وڵاتانی ئەورووپایی ژیانیان ئاسایی دەبردە سەر. ژیانیان لە خۆرئاوای ئەورووپا و ناوەراستەکەی جیاوازی هەبوو لە گەڵ ژیانی جولەکە لە ئەورووپای خۆرهەڵات. لە ناوەراستی چەرخی نۆزدەهەم پاش سەدان ساڵ نەژادپەرستی و چەوساندنەوە و تا جیاکردنەوەیان لە گەرەکی تایبەتی(( گیتو)). وڵاتانی خۆرئاوا و ناوەراستی ئەورووپا بەڵێنیان دابوو رێز لە هاوڵاتیانی جولەکە بگرن و مافی هاوڵاتیان بپارێزن بە پێی ئەوەی ناونرا رزگاری. لەم ئازادییەدا جولەکە رژانە ناو کۆمەڵ و هەنگاویان نا بۆ تازەگەری و لە بەر سەرکەوتنیان لە کۆمەڵگای ئەورووپییدا کەوتنە بەر هێرشی سیاسی بەتایبەتی و پلەی یەکەم لەو دەستانەی دژ بە گۆرانکاری بوون لە کۆمەڵ. وای لێ هات جولەکەکانی ئەورووپایی خۆرئاوا و ناوەراست بوونە نموونەی هاوبەشی ژیانی رۆژانە و زۆریان هەستیان بە دڵنیایی و هیوا کرد گەرچی هێما و دیاردەی دژایەتیکردنی سامیەت و رق و دژ بە جولەکەش هەستی پێدەکرا. پیاوانی جولەکەش هاوشانی پیاوانیتر و هاوڵاتیان بەشداری شەڕی یەکەمی جیهانیان کرد بۆ پاراستنی کەرامەت و سەروەری وڵاتەکانیان و هەروەها دەستی هاوکار بوون بۆ بنیات و ئاوەدانکردنەوەی وڵاتەکەیان تا وای لێهات کەم هەبوو نیگەران بێ و بیر لەوە بکاتەوە رۆژێ دێ نازیەت قڕیان دەکات. جولەکەکانی ئەورووپایی خۆرهەڵات لە ئەڵمانیا و فرنسا لە چەرخەکانی چواردە و پازدەو وە هاتبوون و لە وڵاتانی وەك پۆلونیا و وڵاتانی بەلتیك و ئوکرانیا و روسیا و رۆمانیا دەژیان. بە تێپەر بوونی سەدان ساڵ رۆشنبیری و کەلتووریان لە سەر بنمای ئاینی جولەکە و زمانی یدیش دامەزراند. جولەکەکان دوور لە مەسیحیەکان و لە شارۆچکەی لاچەپ و گوندی دوور دەژیان. لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا زۆربەی جولەکە لە ئەورووپای خۆرهەڵات هەمان پیشەی جارانی خۆیان کرد کە لە مێژە پێیان ئاشنان بەڵام زۆری نەخایاند ژمارەیەکی زۆری جولەکە پێشکەوتن و بوونە بەشێك لە ژیانی چینی

ناوەندی لە شارەکاندا. سەرەڕای ئەوەی کە یاسا کۆنەکانی باو هەبوون بەڵام ئەوان دەوری زۆریان لە ژیانی شارەکان پەیدا کرد.

رەگی دژایەتیکردنی سامیەت لە کەلتووری ئەورووپای خۆرهەڵاتدا قووڵ بوو و بە تایبەتی بە هۆی پروپاگەندەی حکومەت دژ بە جولەکەکان. ئاڵۆزی باری ژیانی جولەکەکان وای کرد زۆریان بۆ ولاتەیەکگرتووەکان کۆچ بکەن. لە سییەکاندا پەیوەندی نێوان کەمینەی جولەکە و زۆرینەی مەسیحی زۆر ئاڵۆز بوو، زۆر کەس لە هەردوو لا جولەکە و ناجولەکە داوای گۆڕانکاری لە ریشەیان بۆ ئەم رەوشە باوە دەکردنەو ملیۆنەها جولەکەیەی کە لە پێش شەڕی یەکەمی جیهاندا لە ئەورووپای خۆرهەڵاتدا دەژیان. بەڵام پاش ماوەیەکی کورت دووچاری مردن بوون بە دەستی مەکینەی فرکردنی نازیەت. بە نەمانیان کەلتووری دەوڵەمەندی جولەکەکان لە ئەورووپای خۆرهەڵات بزر بوو.



کاریکاتوری فەرنساوی " کلاسیکی" دژ بە سامیەت لە ساڵی 1898. زۆر هێما و نیشانەی تاپلۆ کە بابەتی سەرەکی دژایەتیکردنی نازیەتە بۆ سامیەت .

ئەو جیهانە زۆر ترسناك بووە بۆ ژیان ئەوەش لە بەر ئەوە نیە ئەوانەی کە بەدکاری دەکەن. بەڵکو لەبەر ئەو کەسانەی خۆیان دوورە پەرێز رادەگرن و وازیان لێ دەهێنن بەدکاری بکەن.

ئەلبرت ئەنشتاین فیزیائی و خەباتگێڕێك لە پێناوی مرۆڤایەتی.

## ئانە فرانك

ئانە لە یونیو/ حوزیرانی 1929 لە فرانكفۆرت نام ماین لە دایكبووە، دەفتەری بیرەوەرییەكانی یەكێكە لەو بەڵگەنامە گرنگانەی لە سەر قڕكردن. لە تەمەنی سێزدە ساڵییەوە دەستی بە نوسینی كردبوو، لەم دواییەدا دەفتەرەكە لە شێوەیەكی كورت نەكراوەیی بڵاوكرایەوە و وەرگێردراوەتەوە سەر پەنجا زمانی دونیا. ماوەیەكی كەم پاش وەرگرتنی دەستەڵات لە لایەن هتلر لە ساڵی 1939 ئانە لە گەڵ خێزانەكەی ئاوتۆی باوكی و ئادیتی دایكی و مارگوتی خوشكی بەرەو هۆڵندا ڕایانكردووە. ئەوانیش وەك زۆربەی زۆری خێزانە جولەكەكانیتر وایان زانی شوێنی ئارام و شیاوو دوور لە ڕاونانیان دۆزیوەتەوە، لەم وێنەدا تەمەنی شەش ساڵانە و لە تەنیشتیەوە دەستە خوشكی سانەی لە گەڵە كە لە ئومستردام بەوە كۆتایی هات كە نازییەكان لە ناكاو هۆڵندایان لە مایو/ ئەیاری 1940 داگیر كرد. ئەوتوفرانك وەك هەموو جولەكەكانیتری هۆڵندا و وڵاتانیتری ئەوروپایی ناچار بوو بە دوای حەشارگەیەك بگەرێ و خۆیان و خێزانەكانیان لە ترس ڕاونان و ناردنیان بۆ ئوردوگاكانی قڕكردن لە پۆلونیا تێدا بشارنەوە.

خێزانەكەی لە یولیو/ تەمموزی ساڵی 1942 خۆیان لە شوێنێكی نهێنی نهۆمی سەرەوەی خانویەك دۆزیەوە. ئانە لە دەفتەری بیرەوەریەكەیدا سەر بردەی ئەو بڕیارە گرنگەی نوسیوەتەوە(( خۆشاردنەوە كارێكی ترسناك بوو، ئەو جولەكانەی خۆیان شارد بۆوە و ئاشكرا دەبوون یەكسەر ڕەوانەی ئوردوگای گرتنیان دەكردن و مردنیشی سزای ئەو كەسە بوو كە یارمەتی دەدان)). گەرچی هاوسێیەكەیان یارمەتی پێشكەش كردن بەڵام لە دواییدا گستابو پێی زانین و لە 14 ئوگست / ئابی 1944 گیران و وەك سەد هەزار جولەكەی هۆڵندایی پێش ئەوان ڕاپێچی فرانك و لەوێش بۆ وستربورك كران ئوردوگایەكە دەكەوێتە دەرەوەی ئەمستردام و لەوێشەوە خێزانەكە بۆ ئوردوگای گرتن لە ئوشفیتز لە سەرەتاكانی سپتمبر / ئەیلول / 1944 دوور خرانەوە. ئادیتی دایكی پێش ئازاد كردنی ئوشفیتز لە نیار/ كانوونی دووەمی 1945 مرد و لە كاتی خۆیدا ئانە و مارگوت ڕەوانەی

نوردوگای گرتنی بیرجن ـ بیلسن له ئه‌ڵمانیا کرابوون هه‌ردووکیان که گه‌یشتبوون توشی تیفۆ ببوون و له مارس/ئاداری 1945 مردن و رزگاربونیان به چاوی خۆیان نه‌بینیبوو و ئوتو له ژیاندا مابوو و دوایی گه‌رایه‌وه هۆڵندا و ده‌فته‌ری بیره‌وه‌ریه‌کانی ئانه‌ی ده‌ست که‌وت که له لای هاوڕێیه‌که‌ی خێزانه‌که‌یان بوو. له سه‌ده‌کانی ناوه‌ڕاستدا قه‌ره‌ج له باکووری هیند به رێگای وڵاتی فارس و ئاسیای بچوك و بلقاندا به راونراوی گه‌یشتنه ئه‌وروپا. ئه‌و کاتانه وا مه‌زنده ده‌کرا که‌وا ئه‌وانیش ناوێته‌ی جوله‌که و کۆچه‌ریتری بێجگه له جوله‌که‌ن که‌وا مردنی مه‌سیحیانیان له ئه‌ستۆدایه، ساڵانێکی زۆر کوشتنی قه‌ره‌جیك تاوانێکی گه‌وره نه‌بوو، زۆر جار له ناوه‌ڕاست و خۆرهه‌ڵاتی ئه‌وروپا قه‌ره‌جیان راوده‌نا و وه‌ك ئاژه‌ڵ ده‌یان کوشتن. قه‌ره‌ج هه‌ندێکیان به گه‌رۆکی مانه‌وه و هه‌ندێکی تریان تێکه‌ڵ بوون و ناوه‌رانه‌وه. له زۆر ناوچه‌دا وه‌ك کۆمه‌ڵێکی ئه‌سه‌نی زۆرتر ده‌ناسران نه‌ك وه‌ك کۆمه‌ڵه‌یه‌کی کۆمه‌ڵایه‌تی خاوه‌ن دوا پێگه له ریز به‌ندی کۆمه‌ڵایه‌تی. زۆر پێوه‌ند و ئه‌فسانه‌یان بۆ داده‌مه‌زراندن و هه‌تا ئه‌م زه‌مانه‌ش ئه‌وه باوه که‌وا قه‌ره‌ج منداڵان ده‌فرێنن و جادووگه‌ری و نوشته‌کاری ده‌که‌ن و سه‌رچاوه‌ی زۆر نه‌خۆشی ترسناکن. گومان و دڵره‌قی به‌رامبه‌ریان ئێستاش وه‌ك جاران قوڵ و گه‌وره‌یه.

## قه‌ره‌ج و ره‌گه‌زپه‌رستی

قه‌ره‌ج هه‌ر له سییه‌کانه‌وه له هه‌موو ناوچه‌یه‌کی ئه‌ورووپادا ده‌ژیان و له ئه‌ڵمانیادا سی هه‌زار قه‌ره‌ج له خانووی کرفانه وه‌ك هاوڵاتی ئاسایی ده‌ژیان. زۆر پێش هاتنی نازیه‌کانیش دژایه‌تیو جیاوازی نه‌ژادییان ده‌رحه‌ق ده‌کردنو له سه‌ره‌تای سه‌ده‌ی بیسته‌م له ئه‌ڵمانیا (( نوسینگه‌ی زانیاری قه‌ره‌ج )) ده‌ستی به تۆمارو ئه‌رشیفکردن و ناونوسینی بۆ کردنو وا تێده‌گه‌یشتن که‌وا ئه‌وان مه‌ترسییان هه‌یه و ده‌بێ ئاگادار و هوشیار بن و به تایبه‌تی بۆ مه‌سه‌له‌ی (( ناوێته‌ی ره‌گه‌زکان )). له ساڵی 1905 نامیلکه‌یه‌کی وێنه‌دار بڵاوکرایه‌وه و چه‌ندین زانیاری له مه‌ڕ په‌یوه‌ندی خزمایه‌تی و نزیکبوون سه‌دان قه‌ره‌جی ئه‌ڵمانی تێدا بوو. له ساڵی 1926دا له ولایه‌تی بایرنی ئه‌ڵمانی پرۆژه‌ی یاسای

(( قەلاچۆکردنی قەرەج و گەڕۆك و بێکاران )) پەسەند کرا لەم یاسایەدا هاتبوو کەوا هەر قەرەجێك نەتوانێ بسەلمێنێ کار دەکات و بەرهەمی هەیە دەست بە سەر دەکرێت. پاش ساڵی 1933 نازیەکان ئەم یاسایە و یاسای تریشیان پەیڕەو کرد و بە پێی ئایدلۆژی نازیەت دەستکرا بە ڕاونانیان بە هەمان شێوەی دەرحەق بە جولەکە دەکرا. گەرچی سەرکردەی هێزەکانی پاسەوانی تایبەت SS هاینریش هملر بۆچوونی جیاوازی هەبوو، ئەو وای مەزندە دەکرد کەوا نەژادی (( ئاری بێگەرد )) لە نێو قەرەجەکاندا هەیە. بەڵام بیرۆکەکە ئەوە بوو لە لای زۆرینەی زۆریان (( بە پێی پێویست نەبوو )) دوایی کارەکە بۆ ئەوە جێماوە کە بە بیولۆژیای ڕەگەزکان دەناسرا کە دەتوانێ دەستنیشانی ئەو کەسانە بکات کێ دەکوژرێت و کێ بۆی هەیە بژییت.

**یاسای بایرن بۆ قەلاچۆکردنی قەرەج و گەڕۆك و بێکاران**
**16ی یولیو/ تەمموزی 1926**

**بڕگەی یەکەم:** قەرەج و ئەوانەی وەك قەرەج گەڕۆکن . ئەوانەی بە گەڕۆك ناسراون . دەتوانن بە گالیسکە و کرفانەکانیان بگەڕێن کە مۆڵەتیان لە لایەن دەسەڵاتدارانەوە پێدراوە، ئەم مۆڵەتەش بۆ یەك جارە و بۆ ساڵێکە و دەتوانرێت هەر کاتێك لێیان وەربگیرێتەوە. (...)

**بڕگەی دووەم:** قەرەج و گەڕۆکەکان بۆیان نیە زارۆکی لە تەمەنی خوێندنیان لەگەڵ بێ بگەڕێین، دەگونجێ دەستەڵاتدارانی پۆلیس چاوپۆشیش بکات ئەگەر بکرێ ئامادەکاری هەبێت بۆ فێرکردنی منداڵەکان.(....)

**بڕگەی نۆیەم:** دەستەڵاتدارانی پۆلیس بۆیان هەیە هەر قەرەج و گەڕۆکێك بۆ ماوەی دوو ساڵ دەست بەسەر بکەن کە تەمەنی گەیشتبێتە شازدە ساڵ. کە دەتوانێ بیسەلمێنێ کاری تایبەتی هەیە و کار دەکات، ئەوەش لە پێناوی پارێزگاریە لە یاسای گشتی.

# ترولمانی و قەرەج

لە ئادار/مارسی 1933 پاڵەوانیەتی کۆلەمستی کێشی ناوەندی لە پاریزانی ئەریش سیلچ وەرگیرایەوە بەس لە بەر ئەوەی جولەکە بوو، ئەم نازناوە بە ڤالایەمایەوە هەتا یونیو/حوزیرانی1933 کەوا دوو پاریزانی‌تر کەوتنە بەرامبەری یەکتر و ناوبژیوانی ناری لە گۆشەیەکی سەکۆکە راوەستا بوو، نودولف ڤیت لای راستی زۆر بەهێز بوو. لە گۆشەی بەرامبەریشی یوهان ترولمان راوەستا، یەکیتی کۆلەمەستی ئەڵمانی لایەنگیری نازیەت حەزی نەدەکرد ترولمان بۆ ئەم ناز ناوە بەشداری بکات لە بەر ئەوەی قەرەج بوو، بەڵام یوهان ترولمان ناودار بە (( گبس )) قەرەج یەکێك لە ناسراوترین یاریزانایانی میللی لە ئەڵمانیا و نازییەکان هەستیار بوون بەرامبەر رای گشتی، دەبوایە یەکیتی کۆلەمستی هەلاوێری کردبایە و رایگەیاند کەوا ڤیت دەست نیشان کراوە چونکە ئەو دەتوانێ بەر بەرەکانێی ترولمان بکات.

لە 9ی یولیو/حوزیران ترولمانی دژی شکاندنێکی گەورەی لە بەرامبەرەکەیدا و ترولمانی تەمەن 29 ساڵ لە دابەزینی دوازەمینەکەی سەمای لە چوار دەوری دژەکەی دەکرد و بە شێوەیەکی گاڵتەجاری و کەمی ژمارەی خاڵی لە سەر دەژمارد بۆیە ئامادەکەرانی دابەزینەکە هەستیان بە شەرمەزاری کرد و بڕیاریاندا دابەزینەکە یەکسان بێ، جەماوەرەکە زۆر توورە بوون و بۆ چەند دەقیقەیەك دەنگیان بەرز کردەوە و هەرەشەی شکاندنی هۆڵەکەیان کرد، بۆیە ئامادەکەرەکان لە کۆتاییدا لە ئەنجامەکە پاشگەز بوونەوە و بڕیار درا کەوا ترولمانی پاڵەوانی کۆلەمستی کێشی سووکە لە ئەڵمانیادا.

دوایی گۆڤاری تایبەت بە وەرزشی کۆلەمستی (( بۆکس سپۆرت )) رەخنەی لێدەگرت و نوسیبووی (( بەشێوەیەکی بۆکسانێی دەکرد کە هیچ پەیوەندی بە کۆڵەمستێ نەبوو )) یان بە شێوەی (( شانۆگەری )) و کەوتبوە گاڵتە پێکردن بە خۆی و بە (( قەرەجیەکەی کە مەزندە ناکرێ )) پاش هەشت رۆژان نازناوەکەیان لێی وەرگرتەوە و سنووریشی بۆی وەك یاریکەرێکی بۆکسانیان دانا.

بۆ دابەزین و یاریەکی تری کاری پێشینەی بۆ کرا، بەفڕی بۆزەوە دابەزی. لە جیاتی هەڵپەڕین و سەما و سوڕان لە سەر سەکۆکە ئەمجارە چەندین بۆکسی پێکەوەی بۆ دەهات و (( گبسی )) لە جاری پێنجەم بە خوێنەوە بەر دەبێتەوە.
لە ئوردوگای گرتندا هەر دوو براکەی جێدەهێڵێ و لە ساڵی 1939دا دەڵێ دەمەوێ بچمە ناو سوپا و لە سوپای پیادەیی لە روسیا شەڕ دەکەم، لە ساڵی 1942دا (( گستابو )) لە کاتی مۆڵەتێکدا دەیگرێت و رەوانەی ئوردوگای گرتنی نوینگام دەکرێت و ناچار دەکرێت گرانتر و قورستر کار بکات. سەربازەکانی هێزە تایبەتیەکانی ئەس ئەس لە ئاهەنگەکانیاندا بە کردنی یاری (( پاڵەوانی ئەڵمانیا )) رادەبوێرن و کاتی پێبەسەر دەبەن و بۆکسانێ لە گەڵ ترولانی برسی تەمەن 35 ساڵان دەکەن و کە سەربازانی ئەس ئەس بێزار دەبن تەقەی لێدەکەن لە 9ی فبرایر / شوباتی 1943 لە ئوردوگای نوینگام دەیکوژن.

## لە شاهیدی دانی پیاوێکی ئەڵمانی ئەخۆشی سیکس:

هاوکات لە شارەکەماندا هەڵمەتی گرتنی هیمۆسیکسواڵەکان دەستی پێکرد. یەکێك لەوانەی گیرابوون هاورێیەکی من بوو لە تەمەنی بیست و سێ ساڵیدا بووم دەمناسی و پەیوەندیمان هەبوو. گستابو (( پۆلیسی نهێنی )) هاتنە ماڵەکەی و لەوێ راپێچیان کرد. وە نەبێ گەڕان بە دوایدا بەرهەمی هەبێ و ئەگەر یەکێك ئەوە بکات ئەوا ئەویش دووچاری گرتن دەبێ. بۆ گومان و تاوانبار کردن ئەوە بەسە تەنیا ناشنایان بێت. گستابو هاورێکەمی گرت و ماڵەکەیان پشکنی ( ... ) لە هەموویان خراپتر دەفتەری ناونیشانەکەی بوو. ئەوانەی ناویان هەبوو گیران و یان ئەوانەی پەیوەندیان بەو هەبوو لەوانە منیش (....) دەبوایە زۆر وریا بین لە هەموو پەیوەندیەکانمان و ناچاریش بووم هەموو جۆرە پەیوەندییەکانم لە گەڵ هەموو هاورێکانم ببڕم، لە شەقامەکاندا خۆمان لە یەکتری لادەدا تا خۆمان توشی ترسناکی نەکەین. شوێن بۆ هیمۆسیکسواڵەکان دیداریان نەما.

## هیمۆسیکسواڵەکان

کە نازییەکان دەسەڵاتیان وەرگرت راوی ئەو کەسانەیان نا کە هیمۆسیکسواڵ بوو چونکە وایان هەست دەکرد کەوا گەشەی ئەم کۆمەڵەیە هەڕەشە لە ژمارەی بوون لە کۆمەڵگای ئەڵمانی و تەندروستی (( جەستەی میللی )) دەکات، یەکەکانی ئەس ئەس گەمارۆی شوێنەکانی دیداریان دەدان وەك قاوەخانەکان، ماڵە تایبەتیەکانیان، پۆلیس ئەوەی پێکرا بۆ تەنگاو کردنی هیمۆسیکسواڵەکان کردی.

ئەم راونانە کۆششی درێژخایەنی کاری لیبراڵی کۆتایی پێهێنا. نازییەکان هاوکاری هەموو ئەم یاسایانەیان کرد کە دژایەتی ئەوانەی دەکرد کە چالاکی هیمۆسیکسواڵیان هەبوو، لە سییەکاندا راونانی لادەرەکان و گرتنیان زۆر بوو. سەرکردەی هێزە تایبەتیەکانی ئەس ئەس هیلر نوسینگەیەکی بۆ دانا کاری ئەوە بوو ناونوسی هیمۆسیکسواڵەکان بکاو تەنگاویان بکات و زۆر لە نازییەکان داوای چەسپاندنی سزای لە سێدارەدانیان دەکرد بۆ ئەوانەی هیمۆسیکسواڵین (( بێڕەوشتن)).

لە ساڵانی 1939 ـ 1937 ئەم راونانە زۆر بووو ژمارەی گیراوی پیاوانی نەخۆشی ئەڵمانی و نەمساوی گەیشتە 100 هەزار پیاو و لەوانە 15 ـ 10 هەزاریان رەوانەی گرتووخانەکان کردن‌و سێگۆشەی رەنگی وەنەوشەییان لە یەخەدان و پیاوانی ئەس ئەس زۆر درندانە مامەڵەیان لە گەڵ دەکردن بۆیە زۆریان مردن و ژمارەی مردووەکان بەراستی نەزانرا، بەڵام هەندێ زانیاری هەیە کەوا هیمۆسیکسواڵەکان لە گرتووخانەکان 60٪ی ئوردوگاکانی گرتن مردن.

نازییەکان ویستیان نێوان ئایدلۆژیا و (( زانست )) بۆ دژایەتیکردنی نەخۆشە سێکسیەکان بە یەکتری گرێ بدەن و چەندین (( تاقیکردنەوە ))ی نادروستیان بە شێوەی دوور لە زانست لە سەر ئەنجام بدەن و مەبەستیش گۆڕینی رەوشتی هیمۆسیکسواڵەکان بوو.

## کەم ئەندام و (( نامۆیە کۆمەڵایەتیەکان ))

لە بیستەکاندا هەندێ لە زانایان وایان بە باش دەزانی کوشتن و لە ناوبردنی ئەو مرۆڤانــە دروســتە کــە (( بێکــەڵکن )) ballastexistenser بۆیــە چــەند کۆمەڵـەیان لێجیاکردنــەوە و بــە تایبــەتی ئــەوانی کــەم ئەنــدام و شــێتن و ئــەم دەربڕینە چەسپا کە دەڵێ (( ژیــان ژیــان ناهێنــێ )) نازییــەکان ئــەو بۆچــوونانەیان خێرا وەرگرت، کەوا دەیەوێ هاوکاری (( لەش ساغەکان )) بکات و (( نەخۆش )) و (( سووك و بێ نرخەکان )) لە ناو ببات. بــەڵام هەڕەشــە دەرەکییــەکانی دژ بــە (( تەندروستی جەستەی میللی )) کە لە جولەکە و قەرەج بۆیان دەهات بــە دوور خستەوە و جیاکردنــەوە و کوشــتن بەرپەرچیان دایــەوە. هەڕەشــەی نــاوەوەش لــە بیرکردنــەوە یــان کــەم ئەنــدام و لــە مێشك و جەستەکان بــوون و هــەروەها ئــەو کەســانەی کــە لــە گــەڵ (( کۆشــشی میللــی )) نــەدەگونجان و بــە کەســانی (( بــێ بەرهــەم )) ی ئابووریيــان دەزانــین و بــارێکی قورســن لــە ســەر بــە هێــزە بەرهــەم هێنەرەکان. بایولوژی رەگەزی بە (( چاوی کەم )) سەیری دەکردن و خووڕەوشتە خراپــەکانیان بــە پــشتاو پــشت دەزانــن و ئــەوەش ترســناکی زینــدووە لــە ســەر تەندروستی (( جەستەی میللی )).

بۆ(( پاکژ کردنەوەی )) کۆمــەڵگا و (( رەگەزی ئاری )) نازییــەکان بۆ جێبــەجێ کردنی مەرامەکانیان هەزارەها کەسیان لە توێژی هاوڵاتیــان گــرت کــەوا زەحمەتــە پێناسەیان بکرێت. بە بیــانۆی (( نــامۆی کۆمەڵایــەتی )) جیاکرانــەوە. ئــەم توێــژە

ژنە سۆزانییەکان و ئەوانەی یەك دوو کاریان پێسپاردراوە و سەرپێچی جێبەجێ کردنیان کردووە بووە. هەروەها ئایدۆلۆژیای نازییەت سزای ئەوانەشیان دەدا کە رەوشتەکانیان بە جۆرێك لە تووڕەیی لێکدەدایەوە و هەتا ئەوانەی لاساری بچوکیشیان کردبایە و بە دیدی بایولوژییانە بە (( سووك و بێنرخ )) یان دادەنا. لەبەر رۆشنایی زانستی باو لە ئەڵمانیای نازی (( تاوانی زینەوەری )) ئەو کەسانەی لەو خانانەدا ریز دەکران دووچاری نەزۆکی یان خەساندن دەهاتن و لە ئوردوگاکانی گرتندا سێگۆشەی رەشیان لە یەخە دەدان.



وێنەی پروپاگەندەیی پیاوانی جولەکەی کەم ئەندامن کە لە ئوردوگای گرتنی بوخنڤالد لە نێوان ساڵانی 1938- 1940دا گیراوە، ئەم کەم ئەندامانە بۆ نازییەکان هیچ سوودی نەبوو بێجگە لەوەی بکرێنە (( مادە )) بۆ تاقیکردنەوەی تەندروستیەکانیان پاش گرتنی ئەم وێنەیە ئەوانە زۆر نەژیاون.

1934 13 یولیو/ تەمموز

بە پێی یاسا ژن هێنان نێوان ئەڵمانیەکان و کەسانی رەگەز نامۆ و کەسانی ئاکار شێواو قەدەغە کرا.

2 / ئوگست/ئاب

مردنی سەرۆکی ئەڵمانی پول فۆن هیندنبورگ

19/ئوگست/ئاب

هتلر خۆی وەك فوهرر (( پێشەوا، سەرکردە بۆ دەوڵەتی سێیەم )) رایخی سێیەم راگەیاند.

ئوکتوبەر/ تشرینی یەکەم نوڤمبر/ تشرینی دووەم

هەڵمەتی گرتنی هیمۆسیکسواڵەکان لە سەرانسەری ئەڵمانیادا.

1935 ئەبریل/ نیسان

دەرکردنی شاهیدەکانی یەهوا لە فەرمانگە حکومیەکان و گرتنی زۆریان.

21/ مایو/ئەیار

بریار دەرچوو کەوا نابێ جولەکە خزمەتی سەربازی بکات.

15 سپتمبر/ ئەیلول

لە کۆبوونەوەیەکدا حیزبی نازی یاساکانی نورنبیرگی پەسەند کرد.جولەکە بۆی نیە مارەیی لە گەڵ کەسانی خاوەن (( خوێنی ئەڵمانی)) یان پەیوەندی سیکسیان لە گەڵ بکەن، لە سییەکاندا لە ئەڵمانیادا(400) یاسا بۆ سستاندنی هەموو مافەکانی جولەکە دەرچوو.

26نوڤمبر/تشرینی دووەم

بۆ قەرەج و رەش نیە مارەیی لە گەڵ کەسانی خاوەن (( خوێنی ئەڵمانی)) بکەن.

1936 17 یونیو/ حوزیران

سەرۆکی پاسەوانی تایبەت (( ئەس ئەس )) هاینرش هیملر کرایە سەرۆکی پۆلیسی ئەڵمانی.

1 . 6 ئوگست/ ئاب

هتلر یاریەکانی ئۆلومپی لە برلین کردەوە.

1938 13مارس/ئادار

((Anschlus)) رایخی سێیەم نەمسای داگیر کرد.

ئەبریل/نیسان

چەندین یاسا بۆ ناونوسکردنی هەموو سەرمایەی جولەکەکان و ژماردنیان دەرچووە.

6 .15یولیو/تەمموز

نوێنەرایەتی 32 دەوڵەت لە ئەفیان گفتوگۆ لە سەر کێشەی پەنابەرانی جولەکە دەکەن.

17 ئوگست/ ئاب

دەبوایە ژنانی جولەکەی ئەڵمانیا نازناوی (( سارا)) و پیاوەکان ناوی (( ئسرائیل)) بە ناوەکانیان بلکێنن.

5 ئوکتۆبەر/تشرینی یەکەم

مۆرکردنی پەساپۆرتی جولەکە بە پیتی J واتە جولەکە.

28 ئوکتۆبەر/ تشرینی یەکەم

دوورخستنەوەی 17 هەزار جولەکەی بەرەچەڵەك پۆلۆنی لە ئەڵمانیاوە بۆ سەر سنووری پولونیا.

9 .10 نوڤمبر/ تشرینی دووەم

شەوە کریستالیەکە. راونانی دژواری جلەکە و کوشتنی و زیانی زۆر و گرتن و دوور خستنەوەی نزیکەی 30 هەزار جولەکە بۆ ئوردوگاکانی گرتن.

15نۆڤمبر/ تشرینی دووەم

قەدەغە کردنی خوێندنی منداڵی جولەکە لە خوێندنگاکانی ئەڵمانیا، پاش شەوە کریستالیەکە سوید رازی بوو 500منداڵی جولەکە لە وڵاتەکەی وەرگرێت.

1939 30ینایر/کانوونی دووەم

هتلر بە پەرلەمانی ووت شەڕی جیهانی واتە (( قڕکردنی رەگەزی جولەکە لە ئەوروپا)).

21 فبرایر/ شوبات

دەبوایە جولەکەکان زێڕ و خشڵ و میتالە بە نرخەکانیان دابنێن.

29 یولیو/ حوزیران

دوورخستنەوەی 400پیرە ژنی قەرەج بۆ ئوردوگای گرتن لە رافنسبرۆك لە نەمسا.

1 سپتمبر/ ئەیلول

سەرەتای شەڕی دووەمی جیهانە بە گرتنی پولونیا.

کۆمەڵەکانی ئەڵمانی ئینساتز چەند قەشە و ئەکادیمی و جولەکەیان کوشت.قەدەغەی هاتوچۆ بۆ جولەکە پاش کاتژمێری نۆی ئێوارە.

20 سپتمبر/ ئەیلول

بۆ جولەکە نیە رادیۆی تایبەتی بە کار بێنێ.

ئوکتوبەر/تشرینی یەکەم

دوورخستنەوەی جولەکەی ئەڵمانی بۆ دەڤەری لوبلین.

20/نۆڤمبەر/تشرینی دووەم

هیلمر فەرمانی داهەموو (( ژنانی قەرەج و فاڵگرەکان )) بگیرێن.

23/ نۆڤمبەر/تشرینی دووەم

دەبوایە هەموو جولەکەیەك ئەسرەگەزی داود هەڵگرن.ئەم فەرمانە هێدی هێدی لە ئەڵمانیا کاری پێکرا و دوایش لەو وڵاتانەی کە داگیرکران .

1940 ینایر/کانوونی دووەم

یەکەم پرۆسەی کوشتنی نەخۆشە جولەکە ئەڵمانیەکان کە ناتەواو بوون بە گاز کوژران.

ئەپریل/نیسان

ئەڵمانیا وڵاتانی دانیمارك و نەرویج و بلجیكا و هۆڵندا و فرنسای داگیركرد و فەرەجەكانی ئەڵمانیاشی بۆ پۆلونیا ئاوارە كرد.گیتوی لودزی لە جیهانی دەرەوە دابڕی.هیلمر فەرمانیدا نوردوگاكانی گرتن لە ئوشفیتز دروست بكرێت.

3 ئوكتوبر/تشرینی یەكەم

دەركردنی چەند بڕیاری كەنارگراو دژ بە جولەكەكانی فرنسا (( ڤیشی )) دەرچوو.

ئوكتوبر/تشرینی یەكەم

راپێچ كردنی هەموو جولەكەكانی وارشۆ بۆ گیتو. دابڕانی گیتۆ كە لە ناوەراستەكانی نۆڤمبر / تشرینی دووەم لە جیهانی دەرەوە.

1991 ینایر/ كانوونی دووەم

پرۆسەی ناونوس و ژماردنی جولەكە لە هۆڵندا كرا.

1 مارس/ ئادار

هملر سەردانی ئوردوگای ئوشفیتز دەكا و فەرمان دەدا ئوردوگایەكی تر لە بیركناو ((ئوشفیتز 2)) دروست بكەن. رێگا دەداتە كۆمپانیای ئای.جی.فارین كەوا گیراوەكان بۆ دروستكردنی كارگەیەك لە نزیك ئوشفیتز بە كار بێنێ.

## ڕاونانەكە

نازییەكان جولەكەیان بەوە تاوانبار دەكرد كەوا رۆژێ دادێ دەستەڵات وەردەگرن، جا بۆ ئەوەی بتوانن پلانەكانیان دژ بە جولەكە جێبەجێ بكەن دەبوایە جولەكە لە هەموو بوارەكان و چالاكیەكانی كۆمەڵایەتی ئاسایی دوور بخەنەوە. بۆ ئەمەش كار زۆر كرا لە ئەپریلی 1933دا حكومەت و حیزب بریاریان دا كڕین و فرۆشتن لە گەڵ دوكان و بازارگاكانی جولەكە نەكەن. ئەو پیلانە سەری نەگرت، چونكە

گەلی ئەڵمانی پشتیوانیان نەکرد، بۆیە نازییەکان فێربوون کەوا دەبێ ئاگادار بن و پشتیوانی میللی راستەقینە بە دەست بێنن یان رەزامەندی هێمن.
لە سییەکاندا نازییەکان زیاتر لە 400 یاسایان بۆ دامالینی جولەکەی ئەڵمانیا لە مافە شارستانیەکان و ئابوورییەکانیان راگەیاند. جێبەجێ کردنی ئەم یاسایانە لە ئەڵمانیادا ماوەی درێژی ویست، بەڵام لە ئەمسا هەر لە رۆژی داگیرکردنی لە لایەن ئەڵمانیاوە لە مارس/ئاداری 1938 جێبەجێ کرا. لە هەر دوو وڵاتدا هەموو ئەو سامان و سەرچاوەی ژیانی خۆیان و خێزانی دکتور و پارێزەر و مامۆستا و فێرکەر و بەرێوەبەری کۆمپانیای جولەکەیان زەفتکرد و خوێندکاری جولەکەیان رەوانەی خوێندنگای تایبەتی کرد و بواریان نەدەدان لە سیمینارەکان ئامادە بن و زۆربەی مامۆستایانی جولەکەی زانکۆکانیان ناچار کرد واز بێنن و وڵات جێبهێڵن و ئەوانەی نوایەکی هێمنیان دۆزیەوە بە ناچاری هەموو سامانەکانیان لە پاش خۆیان جێهێشت و رۆیشتن.
وەك چۆن بە خێرایی ئاوارە کردن ئەنجام دەدرا ، ئەڵمانیەکان هاوکاری حکومەتەکەیان کرد و هیچ نارەزاییان لە چۆلکردنی ئەڵمانیا لە جولەکە نیشان نەدا و ئەوانەی نارەزاییان هەبوو یان دەستی یارمەتیان بۆ جولەکە درێژ کرد زۆر کەم بوون. لە ساڵی 1940 پرۆسەکانی ئاوارە کردن دەستی پێکرد و پەیوەندی لە نێوان جولەکە و هاوسێ مەسیحیەکان هەستی پێنەدەکرا. دوا نیشانەی جیاکردنەوەکەش دەرچوونی یاسا کە بوو کە لە سپتمبر/ ئەیلول 1941 دەرکرا کە جولەکەکانی ئەڵمانیا ناچار دەکات ئەسرەگەزی زەرد بە پۆشاکی دەرەوەیان وەکەن.

## بابەتی زێری نازیەکان

فرکردن تەنیا لە ناو بردنی جەستەیی نەبوو، بەڵکو گەورەترین پرۆسەی بە ئەخشە بوو بۆ تاڵان لە مێژوودا. لە سییەکاندا دەوڵەتی ئەڵمانی چەندین گەنجینەی تایبەتی بە نرخی جولەکەکانی زەفتکرد وەك پارچەی هونەری، خشڵ خانووبەرە و سامانی پاشماوەی خێزانەکانیان. هەروەها دەست بە سەر چەندین کۆمپانیای گەورە و بانکی جولەکە گیرا. چەند جولەکەیەك ویستیان هەندێ لە

سامانەكانیان بە رێگای دەرباز كردنیان بۆ دەرەوەی وڵات رزگار بكەن بە تایبەتی بۆ سویسرا، ئەو سامانانەش وەك پارەی كاتی و چەك و میتالی بە نرخ و خشڵ بوون.
ئەڵمانەكان بۆ جێبەجێ كردنی پرۆسەی تاڵانە گەورەكەیان ورد بوون بەرامبەر ئەو كەسانەی ئاوارەی ئوردوگای گرتن لە پۆلونیا كران، هەر كە گەیشتن هەموو سامانەكەیان دەست بە سەردا گرت وەك جلوبەرگ و خشل و عارەبانەی منداڵەكان و پێڵاو و چاویلكەكانیان. زۆر لەم كەلوپەلانەیان رەوانەی ئەڵمانیا كردەوە تا گەلی ئەڵمانی بە كاریان بهێنن.
هەتا لاشەكانیان بە كار هێنا، پرچی ژنەكان پەش و پێش كوشتنیان بە گاز، بۆ نموونە گۆریەكانیان لە لایەن مەلەوانەكان و بۆ پالاوتن بە كار هاتن. كیفكی زێری ددانەكانیان داكەنانـد و دووبارە تاواندیانەوە ، خۆڵەمێشی سوتاوی لاشەكانیان كردە پەیین بۆ چاككردنی زەوی. ئیمڕۆ وا گەورەیی و زۆری تاڵانەكە ئاشكرا دەبێت. كارنانەوەی زۆر حكومەتە ئەوروپایەكان لەوانە سوید ئەوە بوو داوایان كرد چەند لیژنەی لێكۆڵینەوەی تایبەت بە توژینەوەی بابەتی قەرەبووی ئەوانی لە ژیاندا ماون بكرێت. ئەڵمانیای خۆرئاوا قەرەبووی سەدان هەزارانی لە جیهاندا دایەوە كە خۆیان یان خێزانەكانیان لە ژیاندا مابوون، بەڵام ئەوانی لە ئەوروپای خۆرهەلاتدا لە سەردەمی دەستەڵاتی شوعیەتدا بوون هیچ قەرەبوو نەكرانەوە.

ئیمڕۆ سكرەگەزكەی جارانم بینی. بە چاوە كەم بیناكەی سەیری كردم و دووركەوتەوە، بێزم لە خۆم كردەوە و بۆیە تفم لە ناو دەستە سڕەكەم رووكرد، ئەو نەخۆشێكی من بوو كە بینیم هاورێیەكەی جێهێشتبوو و بێكار و بێچارە بوو، دەستم بە سەری داهێناو لە لای خۆم ئیشم پێكرد و چەند ساڵ لە عیادەكەم ئیشم پێكرد و فێرم كرد تا ئەم كۆتاییە هات. زۆر گۆڕا بە رادەیەك ناتوانێ سلاویشم لێبكات. من لە زەلكاو رزگارم كرد.
لە بیرەوەرییەكانی رۆژی 9 ئوكتوبەری 1935

## کارە توندڕەوییەکان دژ بە چالاکییەکانی جولەکە

حیزبی نازی لە ئەبریل/ نیسانی 1933 یەکەم هەنگاوی دەست پێکرد بۆ زیان گەیاندن بە ئابووری جولەکە. یەکێك لەو ڕێگایانە ئەوە بوو کوڕانی پێشڕەوانی هتلریان هان دەدا کە تابلوی (( ئاگادار کردنەوە)) بەو بازرگەیانە هەڵواسن کە خاوەنەکانیان جولەکەن. ئەم جۆرە کارانە دژ بە دکتور و پارێزەرەکان و دەزگاکانی جولەکە لە سەرانسەری ئەڵمانیا دەرکرا.

دکتورە هیرتا ناتهورن سەبارەت بە بەسەرهاتی ئەبریل/ نیسانی 1933 دەگێڕێتەوە(( ئەم ڕۆژە بە پیتی ئاگر لە سەر دڵم نەخشاوە، بڕوا دەکرێت ئەو هەموو شتانە لە چەرخی بیستەمدا ڕوو بدات ؟! منداڵان تابلۆ بە دەست لە پێش تابلۆکانیان نوسراوە (( لە جولەکە مەکڕن)) ڕوو لە عیادەی دکتۆرە جولەکەکان مەکەن.لە جولەکەی خۆفرۆش مەکڕن ، جولەکە درۆزن و نیشانەی فێڵبازیین )).



ئێـوارێ لـە هـوهنزولردام سـێ پیـاو لـە گـەڵ ژنەکانیانــەوە دیــدارمان هـەبوو، هەمووماڹ دکتۆر بووین ، کەمترین شت بڵێم ئێمە رەش بین بووین، ئەمیل کە

تـابلۆی نـاوی دکتۆرەکـان سـواخ دەدرا و عیادەکانیــان شـپرزە دەکـران. خەڵکەکـە بێدەنگ وەستا بوون و تەماشایان دەکرد، دیار بـوو لـە بیریـان چوو بوو تـابلۆی ناوەکەی من سـواخ بـدەن ئەگـەر وابایـە وادەزانم کاردانـەوەم بـە هێـز دەبـوو. کـات ئێوارە بوو کە کوڕێك سـەری لێمـدا (( ئایـا ئێـرە نوسـینگەی کۆمپانیـا؟ )) منـیش وەڵامـم دایـەوە (( نـەخێر ئێـرە نوسـینگەی کۆمپانیایـەکی جولـەکان نیـە، ئێـرە عیادەی دکتۆرە، ئایە تۆ نەخۆشی؟))
یەکێك بوو لە برادەرەکانمان ویستی بڕوامان پێبکات کـەوا هـەموو شـتەکە چـەند رۆژێکتر تەواو دەبێ، لە تووڕەییەکەم نەگەیشتن کە ووتم : بمانکوژن بەرەحمترە و زۆر مرۆڤانەترە لەم کوشتنە دەروونیە، ئەوانە دەیانەوێ..........بەڵام هزری مـن هەر لە سەر راستی بوو.

## سیجر شتیدت

نـورجنی سـیجر شـتیدت یـەکێك بـوو لـە گـەورە رەخنـەگران لـە سـەر نازییـەت و نـارەزایی تونـدیـشی لـە سـەر سیاسـەتی خۆگونجانـدن و دووره پـەرێزی سـویدی هـەبوو، نوسـەر و رۆژنامـەنووس لـە رۆژنامـەی یوتیبـوری هانـدلس و شـوفارت تیدنگ و قۆشمەچی و گاڵتە ناسرابوو، ئەوەی خوارەوە بڕگەیەکە لە ستوونەکەی (( ئیمرۆ)) کە لە 27 فبرایر/ شوبات 1936 بڵاوکراوەتەوە.
زانکۆی نـاوداری ئینگلیـزی ئوکسفورد و چـەند زانکـۆیتر رازی نـەبوون لـە یـادی 550 ساڵەی دامەزراندنی زانکۆی هایدلبیرك نوێنـەریان رەوانـە بکـەن. هـەروەها زانکۆ و ئینستیوییەکانی سویدیش بۆ ئاهەنگ یـادی 550 سـاڵەی دامەزراندنەکە بـانگ کـرا بـوون وەك زانکۆکـان ئیـنگلترای دەسـتە خوشـکەکانیان نـەبوون کـەوا نوێنـەر رەوانـەی ئاهەنگـەکانی ئـەڵمانی لـەم قۆنـاخ و پـێش هاتـە هەنوکەیـەکان نەکـەن. زانکۆکـانی ئینگلیـزی گازەنـدەیان بـە بیـانۆی شـیاو هـەبوو و بـۆ ئـەم

مەبەستمان هۆیەکانیان دەتاشراو نەبوون و ئەویش ئەوە بوو کەوا رژێمی ئێستای لە ئەڵمانیا بنچینەکانی هەموو توێژینەوەی زانستیەکانیان هەڵتەکاندووە و لێکۆڵینەوەکانیان دوورن لە راستی (...).

بۆیە زانیاری ئینگلیز بۆ رێزگرتن و پاراستنی گەورە راگرتنی پیرۆزی بوارەکانی زانست بوو کە نەچوون و دووبارە کردنەوە بوو و بەرز راگرتنی گیانی کە هەر بوارەکانی زانست و توێژینەوەی جیا دەکاتەوە.(...)

بە خۆشی و لە ناخەوە دیارە کەوا زانکۆکانی سویدی وەك هاورێکانیان بە ئینگلترا پشو تەسك نەبوون)).


DAGENS NYHETER.

SKONINGSLÖS TYSK JUDEBOJKOTT

HEIMOJUMALA OCH LAPPO.

Jude som skjutit lynchad i häktet.

Finsk nationalism under reflexverkan från tysk nazism.

Tyska händelserna inför kulturell svensk opinion.

516 SÅNDE BOKLISTOR.

RIKSDAGEN GILLAR IDROTT OCH REDUCERAR ANSLAGET.

Frågan för Österrike: skall fascistfärgen bli svart eller brun?

لە ساڵی 1933 تا کۆتایی شەڕەکە. رۆژنامەکانی سویدی لە سەر کارەکانی ئەڵمانی نازی دژ بەجولەکەیان دەنووسی، بەردەوام خوێنەری سوێدی دیمەنی راستی لە رووداوەکان ئاگادار بوو.

# ناچارکردنی جولەکە بۆ دەرچوونیان لە خوێندنگا

لە پاش ساڵی 1933دا ئیش کرا بۆ دوورخستنەوەی خوێندکارانی جولەکە لە خوێندنگاکانی ئەڵمانیدا. لەم وێنەیەدا دیارە کەوا لە وانەی ئایدلۆژی نازی چۆن بێز و پیسایی بە خوێندکارانی جولەکە دەکەن بە نوسینی ئەم رستەیە لە سەر تەختەرەشەکەی پۆلدا (( جولەکە دوژمنی گەورەمانە و ئاگاداری جولەکە بن! )) کیژە خوێندکارەکان دەگێرنەوە کە چۆن ئایدلۆژیەی نازیەت لە سییەکاندا کاریگەری لە سەریان هەبوو.




(( بڕیاری زۆرکردنی ژمارەی خوێندکاران لە خوێندنگاکانی ئەڵمانی گۆڕانیکی بنەڕەتی بۆ)) هیلماجیفن ـ لودمیر))ی کیژۆلە ـ جولەکەی تەنیا لە خوێندنگای (( رانجسدورف ))ی هەڵگەوتووی قەراغ بەرلین ( هەستم بە تەنیایی کرد، هاورێم

ئەما ، بێبرادەر و جیران مامەوە هەموو لێم دەترسان هەندێ لە جیرانەکانم سەرزەنیان دەکردم و دەیانوت (( سەرزنشمان مەکەوە نامەویت بیتەوە لامان، ئێمە ترساویین و بۆمان نیە پەیوەندیمان بە جولەکەوە هەبێت )) بۆ کیژۆڵەی جولەکەی دانیشتووی نورینبیرك لورە جانگ سالهایر کە لە ساڵی 1933دا تەمەنی یازدە ساڵان بوو ئاسایی بوو لە خوێندنگا بمێنێتەوە چونکە باوکی سەرباز بوو لە (( فەردون)) ئەوجا کیژێکی ناجولەکە پێی وتبوو ((من ...من ناتوانم هاوڕێی ڕێگات بم بۆ خوێندنگا نامەوێت کەس بە یەکەوەمان ببینێ)) مارشا ئابل نوسیویەتی، بە تێپەر بوونی ڕۆژێکیتر لە تەمەنی حوکمی نازیەت نێوانمان لە گەڵ جیرانەکان زۆرتر کەلەنی دەکەوتێ، دۆستە خۆشەویستە کۆنەکانمان نەمان، ئەوانەی چەند ساڵان پێکەوەبووین گۆڕان لە ناکاو تێگەیشتن ئێمە و ئەوان جیاوازیین.

## شەوە کریستیاڵیەکە

لە 7 نوفمبر/تشرینی دووەم گەنجێکی جولەکەی تەمەن 17ساڵان ((هرشل جرینزبان)) لە پاریس تەقەی لە سکرتێری نوێنەرایەتی دبلوماسی ئەڵمانی (( ئەرنستفۆم رات)) کرد، ئەویش وەك هەزارەها جولەکەیتر دایك و باوکیان لە ئەڵمانیاوە هەفتەیەك بوو بەرەو پۆلونیا شاربەدەر کرد بوو و تەقەکردنەکەش نارەزایی بوو لەسەر ئاوارە کردنی دایكوباوکی کە گوزەرانیان لە سەر سنوور زۆر ئاڵۆز بوو و کە بریندارەکە مرد وەزارەتی ڕاگەیاندن لە سەر زاری وەزیرەکەی (( جوزیف جوبلز )) بە میدیاکانی ڕاگەیاند کەوا جولەکە بەرپرسن لە کوشتنەکە. ئەوەش بووە هۆی گەورەترین و درندەترین شاڵاوی ڕاونانی جولەکە لە مێژووی ئەورووپی هاوچەرخ.

لە ئێوارەی 9 و 10/ نوفمبر/ تشرینی دووەم لە هەموو ناوچەکانی ئەڵمانیادا سەدان پەرستگای جولەکە خاپوور کرا، خانویان ڕووخاند و هەزارەها کۆگەی بازرگانی جولەکەیان ڕووتکرد، هێرش کرایە سەر گۆرستانی جولەکان و سەدان

جولەکە کوژران و هەزارەهاش قۆل بەستکران و رەوانەی ئوردوگاکانی گرتن کران و جولەکەیان بەوە تاوانبار کرد و ناچار کران قەرەبۆکەی بە پارەیەکی زۆر بدەنەوە و حکومەت پارەکەی بە ملیار مارك خەملاند. قەرەبۆکەیان لە کۆمپانیاکانی دابینکردن مسۆگەر کرد و داواشیان لە خاوەن کۆگە جولەکەکان کرد شوێنەواری خاپوورەکان پاك بکەنەوە (( سیما و ناکاری شەقامەکانیش وەك جاری جاران لێبکەنەوە)).



لە لای چەپ . خوێندکاری زانکۆکان ئەو کتێبانە (( قەدەغەن)) دەسوتێنن کە نوسەرەکانیان جولەکەن یان کەسانیترن . برلین 5/مایو/ئەیار/1933.

ماوەیەکە دەستمان بە چاودێری رێك کرد و خشتەمان بۆ بنچینەی رەگەزیی بۆ ژیانی رۆشنبیری ئەڵمانیەکان داناوە. دیارە پێویستە سوود لە شارەزایی و زانایی

ئەو فەرمانبەرانە وەرگرین کە لە کتێبخانەکاندا کاریان کردووە و نوێنەرانی نازییەکانیش بەشدارن (....) بەوە نیوەی کاری ئامادە کردن بۆ لادانی نوسەر و ئەدیب و مامۆستایانی زانکۆیی جولەکە لە ساڵی 1933دا تەواو ببوو.

**چەند بڕگەیەك لە گۆڤاری پسپۆر لە کاروباری کتێبخانەکان 1938**

پردێك لە سەر شەقامی (( ئاری )) لە گیتو (( گەڕەکی دابڕاو )) لە لودزی پولونیا ، دەبێ جولەکەی گیتو لە جیهانی دەرەوە بە تەواوی دابڕێن. هەندێ جار ناچار بووینە پردی وا لە گیتو گەورەکاندا دامەزرێنن بۆ بەشکردنی شەقامی هاتوچوی (( ئاری )) و ئاپووڕەی خەڵکەکە لە سەر پردەکە دیارە بەوەش باری ژیانی خەڵکەکە دەردەکەوێت کە چۆن لە گیتودا زۆری خەڵك لە رووبەری بچوکدا دەژیین.

## دروستکردنی گیتوکان

له سەدەکانی ناوەراستەوە ئاسایی بوو کەوا جولەکە لە گەرەکی تایبەتی دوورە پەرێز لە شارەکاندا بژیین و بەم گەرەکانەیان وتووە (( گیتو )) و لە سەدەی شازدە باو بووە. لە سەدەی هەڤدەدا و لە سەدەمی شەڕی ناپلیوندا گیتوکانی ئەڵمانیا هەڵگیران. بە هەڵگیرسانی شەڕی دووەمی جیهانیدا لە 1ی سیپتمبەر/ئەیلول 1939 نازییەکان لە پۆلونیادا زۆر بە خێرایی پەیرەوی ئەوەیان کرد کەوا جولەکە پۆلونیاکان ماڵەکانیان چۆڵ بکەن و روو لەو شوێنە تایبەتیانەی شارەکان بکەن کە یەکەمینی گیتویان بۆ ئەم مەبەستە لە ساڵی 1940 دروستکرد. زۆری نەخایاند لە پۆلونیا و ئەوروپای خۆرهەڵات سەدان گیتوی گەورە و گچکە دروستکران.

سیاسەتی نیشتەجێبوون لە گیتوکان سەرەتای ئوردوگاکانی گرتن و کاری کۆکردنەوە بوون بۆ ئاسانکردنی پرۆسەی قڕکردن.

فەرمانەکانی هایدریش سەرۆکی دەزگای ئاسایش لە هێزەکانی ئەس ئەس سەبارەت بە چۆنیەتی کۆکردنەوەی جولەکە. لە ساڵی 1939 دەرچووە.

پێویستە جولەکە لە گەرەکی دوور خراوە (( گیتو )) لە شارەکاندا کۆبکرێنەوە تا بە ئاسانی بتوانرێت چاوەدێرییان بکرێت و کۆنترۆڵ بکرێن بۆ ئاوارەکردنیان . کاری زۆر خێرا ئەوەیە دەبێ دێوەرەکانی جولەکە لە گوندەکان نەمێنێ، دەبێ ئەم کارە بە سێ چوار هەفتەی داهاتوو ئەنجام بدرێت، لە بەر ئەوەی فرۆشیارە جولەکەکان لە گوندەکاندا ماون دەبێ لە گەڵ ڤێرماخت پەیوەندی بکەین بۆ هێشتنەوەی ئەو جولەکانەی کە بۆ دابینکردنی خواردەمەنی سوپا دەمێننەوە، بۆیە ئەم فەرمانەم دەرکرد.

1. گواستنەوەی جولەکەکان بە خێرایی بۆ شارەکان.

2. دوور خستنەوەی جولەکە لە ئەڵمانیا بۆ پۆلونیا.

3. گواستنەوەی ئەو قەرەجانەی کە هێشتا ماون بۆ پۆلونیا.

4. بەهۆی شەمەندەفەرەوە بە بەرنامەیەکی رێکوپێک جولەکەکان لە خاکی ئەڵمانیاوە بگوازنەوە.

(( بەیانی رۆژێکی خۆش و جوان بوو. ئەو شەقامانەی لیتوانیەکان گرتبویان بە جولە و زیندوو بوو. (...) لەم نزیکانە یەکەم پرۆسەی گواستنەوە بۆ گیتو ئەنجام دەدرێت ، وێنەی سەدەکانی ناوەڕاستە . تەنێکی خاکی رەشی دەهاژوورێت. پشتیان لە ژێر باری گراندا زیرەی دێ. ئێمە ئەوە دەزانین کاتمان لەم زووانە تەواو دەبێ، من سەیری ئاشوبەی ماڵەوە دەکەم، شتە بەستراوەکان و کەسە رەشبینەکان ، شتەکانم بە بڵاوکراوەیی دەبینم. ئەو شتانەی بە کارم دەهێنان خۆشم دەوێن.(...) ژنەکە خەیاڵ ئاڵۆز و نیگەران لە ناوەندی گەنجینە کۆکراوەکانەوە و ئازانێ چییان لێ بکات. دەگرێت و دەستەکانی لە یەکتری دەدات ، لە ناو هەموو شتەکانی چوار دەورم دەگریان ، هەموو شتێ دەگریان.

لە رۆژانەی ئەسمق رودا شفسکی تەمەن 13 ساڵان ڤیلنیوس

6 سپتمبر/ئەیلول/ 1941

Judisk karavan.



ETT GHETTO SKAPAS.

وتارێکە لە رۆژنامەی ئەفتونبلاتی هاودەنگی ئەڵمانیا 14/ئوگست/ئابی 1941 نوسینگەی رۆژنامەوان فرتیز لونگرین. مۆڵەتی تایبەتی هەبوو بۆ هاوڕێ کردنی پێشەوەی هێزەکانی ئەڵمانیا بۆ دروستکردنی گیتو لە کاوناسی لیتوانیا. بێگومان وتارەکە تێگەیشتنی دژایەتی و درندایەتی جەماوەری لیتوانیای دژ بە جولەکەی لە کاتی پێشڕەویی ئەڵمانیەکان هەبوو، هەروەها بۆ دروستکردنی گیتوش.




ئیمرۆ یەکشەممە 13 ئۆکتۆبەر/ تشرینی یەکەم بۆچوونێکی نامۆ لە ناخمدا گەڵاڵە بوو، روون بۆوە کەوا 140 هەزار دانیشتووی جولەکەی دەورو پشتی وارشۆ ناچار دەکرێن ماڵەکانیان چۆڵ بکەن و بگوازنەوە گیتو. دەفتەرەکان لە جولەکە چۆڵکرا و 140 هەزار مەسیحی ناچار کران ناوچەکانی گیتۆکەیان چۆڵ بکەن، بە درێژایی رۆژدا گەلویەل دەگوازرایەوە، خەڵکەکە بازنەیەکیان لە چڤاتی جولەکەکە بەستبوو و دەیانپرسی شەقامەکانی گیتو کامەن.

ئیمانوێل رینجلبلوم مێژوو نووس لە وارشۆ ئوکتۆبەر / تشرینی یەکەم 1940

## ژیان لە گیتۆدا

یەکەمین گیتو لە ساڵی 1940 دروستکرا ، لە سەرەتای 1942 ژمارەی گیتوکان گەیشتە سەدان گیتو کە لە هەموو دەڤەرەکانی پۆلونیا و ئەوروپای خۆرهەڵاتدا بڵاو بوون. هەر بە تەنیا جولەکەی پۆلونیایان لەم گیتویانەدا نەپەستا بوو بەڵکو جولەکەی وڵاتانی ئەڵمانیا و نەمساشیان تێدا کۆ کردەوە. هەروەها هەندێ قەرەجی ئەڵمانیاش گەیشتێ. گوزەران لەم گیتویانەدا بەرگە نەدەگیرا.دەسەڵاتدارانی ئەڵمانیا نەیاندەویست (( بنەماکانی کەمەکە )) کۆمەڵایەتی ناسایی لەم شوێنانەدا پەیرەو بێت. تا وای لێ هات گیتو بووە تەڵەی گیانبەر . سەر زمێری گیتوی وارشۆ گەیشتە 400 هەزار کەس چڕی دانیشتوانان بۆ هەر یەکێك 7/5 مەتر بوو. زۆر خێزانی 15 کەسی و زۆرتریش یەك ژووریان بەردەکەوت، لە زستاندا پەیداکردنی سوتەمەنی زێدە زەحمەت بوو تا وای لێ هات بە خەلووزیان دەووت (( مروارێ رەش )).

خواردن پەیدا کردن خەباتێکی دژواری دەویست. رێژەی یەکەی خواردن لە لایەن ئەڵمانیەکان دابەش دەکرایە سەر دانیشتوانی گیتوی وارشۆ 200 یەکە بوو. (( لە نەخۆشخانەکانی سویدا ئێستا بۆ کەمکردنەوەی کێش 1000 یەکەی خواردن وەردەگرێت)). بۆیە دزە کردنی خواردەمەنی بۆ ناوەوەی گیتو بۆ بەردەوامی ژیان پێویست بوو. ئەوەش جێگای مەترسی بوو بە گیران یان شاردنەوەی خواردەمەنی لە باخەڵیان بی یەك و دوو دەبوە مایەی تەقە لێکردن و کوشتنیان . ئەم گوزەرانە خراپە بووە سەرچاوەی نەخۆشی کوشندەی زۆر بە تایبەتی تیفوئید. رێژەی مردنی (( سروشتی)) بە شێوەیەکی درامی بەرز بۆوە. لە ساڵی 1941 لە سەدا دەی دانیشتوانی گیتوی وارشۆ لە برسان و بە نەخۆشی مردن. چاودێری تەندروستی زەحمەت ببوو، دکتۆر و برین پێچە جولەکەکان سەرچاوەی دەرمان و خواردەمەنی گونجاو شوێنیان نەبوو. دکتۆرێك وای نوسیبوو (( مرۆڤە چالاك و زیندوو و بە کارەکان بوونە گیانەوەری ساردوسڕ خەواڵوی بەردەوام. لە سەر جێگاکانیان هەڵنەدەستانەوە بۆ خواردن و خواردنەوە و ئاودەستیشی ... بۆ شەیدایان و پەرۆشییان بۆ خواردن گیانیان لە دەست دەدا. پەلاواژ دەبەنەوە و

دەمردن و نانی رەقیان لە دەستا بوو. هیچ سەرچاوەی یارمەتی ئەو هەزارەها منالە لاواز و هەتیمە بێ دەرەتانانە نەبوو، تەرمی مردووەکان لە سەر شەقامەکان هەڵدەدرایەوە و بە پارچە رۆژنامەیەك دادەپۆشرا و چاوەری ئەوە دەبوون تا بۆ گۆرستانە بە کۆمەڵەکان راماڵدرێن.سەرەرای ئەو بارە نالەبارانەی ژیان رۆژەکان (( ئاسایی )) بەرێ دەکران، گەرچی فێرکردن قەدەغە بوو بەلام فێربوون دەکرا. لە لووز 63 خوێندنگا هەبوو کە 22330 خوێندکاری تێدا بوو.
گەنجی وەك داڤید سایرا کوفیان و زۆری وەك ئەو هەر فێر بوون ، لە رۆژانەکەیدا نوسیویەتی لە رۆژی 25ی مارس/ ئادار / 1942دا (( هەست بە نەخۆشی گران دەکەم. دەخوێنم و بەلام ناتوانم هەرگیز فێربم، پرۆفە لە سەر فەلسەفە و برسیەتی، ئەوانە ناوێتە سەعاتە )).
کە پۆلونیا لە لایەن ئەڵمانیەکان گیرا سەدان پەرستگای جولەکەیان ئاگر تێ بەردا، بەلام ئەوان نوێژی ئاسایی خۆیان هەر دەکرد و زۆر جاریش پەرستن و دینداریان قەدەغە بوو. ئەگەر گستابو هەستی بەوە کردبایە یان ئەس ئەس بۆنی ئەم شتەی کردبایە نوێژکەران بە چەندین شێوە ریسوا دەکران. ئەگەر تەقەشیان لێنەکردبایە ردێنیان دەبرین، یان ناچار دەکران میز بە کتێبەکانی نوێژ و کتێبە پیرۆزەکانیان دابکەن. کۆمەلە کتێبە جولەکە تایبەتیەکان و کتێبخانە گشتیەکان مەبەستی گرنگی ئەڵمانیەکان بوو. هەتا ئەرشیفە دەوڵەمەندەکەی جولەکەکان کە لە پۆلونیا و ئەوروپای خۆرهەلاتبوو زەفتکراو لە ناوچوو.
کە لە ساڵی 1942دا لە گیتوکاندا جولەکەکان دەرکران کتێب و دەقەکان جێمان و بوونە سوتەمەنی، لە گیتودا چالاکی هونەری و شانۆیی و مۆسیقا و وێنەکێشان بۆ بەرزکردنەوەی ورەیان نمایش دەکرا بۆ نموونە لە لودز شانۆگەریەك بۆ بوکەشوشەی منالان هەبوو. لە وارشۆش تیپی گۆرانی منالان هەبوو، چەند نمایشی شانۆگەری و مۆسیقایی کراو بەردەوام بوو تا هونەرمەندەکان دوور خرانەوە. مێژوو نوسان ئەوانەیان بە خەبات و بەرهەڵستی بۆیان تۆمار کردووە.
کەسانی وا زۆر هەبوون کە لە گیتوکاندا دەژیان بروایان وابوو کەوا تۆمار و نوسینەوەی رووداوەکان زۆر گرنگ و بایەخدارە بۆ دوارۆژ، هەندێکیان رۆژانەیان نوسیویەوە و هەندێکیتر دووان و دیتنەکانیان لە سەر ژیانی گیتودا تۆمار دەکرد

و بەڵگەنامەکانیان هەڵدەگرت. هەروەها تاوانی ئەڵمانیەکان و کردەوەی کەسەکان تۆمار دەکران . لەوانە مێژوو نوسی وەك ئیمانوئیل رینجلبلوم و مامۆستا حایم کاپلان لە وارشۆ و یاسا ناس ئەفرام توری لە کوفنو (( کاوناس )). ئەڵمانیەکان دانیشتوانی گیتۆکانیان بە پارەی زۆر کەم بە کار دەهێنا، زۆر لە گیتۆکان کاریگەری بەرچاویان لە بەرهەمی شەڕەکە هەبوو. بەرهەمەکانی گیتۆکانی وارشۆ ، لودز و بیالستۆك و سوسنوفیتسی راستەوخۆ بۆ بەرهەمەکانیان بۆ خزمەتی بەرهەمی شەڕ بوون. یان جولەکە هەبوون لەم گیتۆیانەدا بەرهەم و قازانجەکەیان بۆ کەسێکی ئەڵمانی بوو و قازانجی زۆریش دەدایەوە و زۆریان وا تێدەگەیشتن چاك و زۆر ئیشکردنیان باشترین بواری رزگار بوونە بۆیان. بەڵام مەسەلەکە دوایی و ئێستا دەرکەوت هەمووی پەند بوو بە ئارەزووی ئەڵمانیەکان بۆ فڕکردن و سوود وەرگرتن لە بەرهەم و بە کارهێنانیان.



پاش داگیرکردنی پۆلونیا لە لایەن ئەڵمانیەوە لە ساڵی 1939دا جولەکەکان ناچار کران ئەستێرەگەزی داودی بە ئاشکرا و بۆ ناسینەوە لە پەخە بدەن، لە وارشۆ دەسماڵێکی ئەستێرەگەزکە شین بوو و لە دەسماڵێکی سپی دەدرا و لە قۆڵ دەبەسترا. بۆمان و ژیان ئەم پیرە ژنە دەسماڵەکان دەفرۆشێ.

وێنەکە لە لایەن عەریفی ئەڵمانی هێنرش یوست لە 19 سپتمبر/ئەیلول 1941 گیراوە.

## (گەورە دەستەڵاتدارەکە ) لە گیتو

لە گیتودا بابەتی دڵخۆشکەر زۆر کەم بوو. بەڵام هەندێ جار هۆیەك دەبوو بۆ پێکەنین، حـاییم کـاپلان لـە رۆژنامەکەیـدا لـە 15ی مـایو/ ئـەیار/1940دا نوسیویەتی:

جارێك نازییەك لـە گوندەکانـەوە هـاتبوو و لـەوێش دەبێ جولەکە بـە دیتنـی سەربازێکی نازی بۆ رێزگرتن سڵاوی لێبکەن و دەستی بکوشن و شـەبقەکەی بـۆ داگرن، ئەم نەریتەش لە وارشـۆدا پـەیرەو نـەبوو، بـەڵام ئـەو (( مێوانـە بـەرێزە)) ویستی توندی بنوێنێ و یاساکانی ئەو شوێنانەی ئەو لێوەی هاتبوو پەیرەو بکات. لە ناکاو لە شەقامی کارمیلکای جولەکەکان شڵەژا و نازییە گێلەکە داوایی دەکرد رێبـواران هـەموو بـۆ رێزگـرتن شـەبقەکانیان بـۆی داگرن، لـە ئەنجامـدا چـەندین کەس هەڵاتن و زۆریش خۆیان شاردەوە و بەشێکیش گیران چونکە سەرپێچیان لە رێزگرتنی کردبـوو و دارکـاریش کـران و خەڵکەکەی تـریش بـە پێکـەنین و گاڵتـە کردنـەوە تەقینـەوە.( هەڵپەرستەکان) گـەورە راسـتەقینەکانی شـەقام بینیـان چ رووی داوە تامی زۆریان لـە گوێڕایەڵبوون بـۆ نازیەکـە وەرگـرت. بـە گاڵتـە رێـزی زۆریـان بـۆ دەربـڕی. ئـەوەش بـۆ ئـەوە بـوو (( گـەورە دەسـتەڵاتدارەکە)) بکەنـە گاڵتـەجاری رێبوارەکـان ، بـەراکردن بـۆی دەچـوونە پـێش و سـەد جـار سـڵاویان لێدەکرد و شەبقەکانیان دادەگرت. هەندێکیان بە رووی وشکەوە ئـەوەیان دەکـرد و هاورێکانیش لە پشتەوە پێدەگەنین و ئـەو دەستەیە دەرۆیشت دەسـتەیەکی تر جێگایان دەگرتەوە و بـۆ نازییەکە دەهاتنـە پـێش و بـە سـەری رووتـەوە سـەریان بۆی ئەوی دەکرد.



چەند منداڵێکی جولەکە لە سەر ڕۆخی شۆستەکەی گێتوی وارشۆ دانیشتون.

(( گوێم لێ بوو کەوا رابینێک لە وینگر و لە پومکبور کوژرا، فەرمان درا شەقامەکە گەسک بدرێت. فەرمان درا پاشماوەکان هەڵبگیرێتەوە و لە ناو شەبقەکان بکرێن، کە بۆ پێشەوە دەنوشتایەوە سێ قەمەی تفەنگی تێراکرا. نیشەکەی کرد و بەردەوام بوو لە نیشەکەی کە مرد)).

ئیمانوێل رینجلبلوم (( بیرەوەرییەکانی لە گێتوی وارشۆ ))
26/ئەبریل/نیسان/ 1941




بندزن 1942. ئەفسەر فرانزبولتز لە برسلاو مناڵانی جولەکەی کۆ کردیتەوە بە هەموو هێزییەوە لە سەریان هاوار دەکات (( ئێوە شەڕتان دەوێت )) سەرنج دەدەین و بێ ئاگایین ، مناڵێکی تەمەن شەش ساڵان، دەوێرێت بچێتە پێش و بڵێ (( نا ، مامە ، پیاوانی ئەس ئەس . ئێمە شەڕمان ناوێ، ئێمە کەمێك نانمان دەوێ))

ئەلا ـ لایبرمان ـ شایر

## بڕاره ئەستەمەكان

بەرێوەبردنی كاروباری ناوخۆی گیتوكان لە لایەن جولەكە خۆیانەوە بەشێكی ناوەندی سیاسیەتی نازییەكان بوو، لە هەموو گیتویەك جڤاتێك دامەزرا بە ناوی جڤاتی جولەكە. ئەندامە پیاوەكانی ئەم جڤاتە بە هەڕەشەی مردن ناچار بوون داواكانی ئەڵمانیەكان ورد جێبەجێ بكەن. ئەم جڤاتە لیستی ئەو ناوانەیان ئامادە دەكرد كە نۆرەی ئاوارە كردنیان دێ. هەروەها پۆلیسی جولەكەش ئەوانەیان ئامادە دەكرد كە بۆ لە سێدارەدانیان دەبردن و هەر ئەو پۆلیسیانە سواری قەتار و لۆریشیان دەكردن. ئەگەر بەرهەڵستی لە خشتەی كارەكانیان هەبوایە سزاكە ئازاردانی بە كۆمەڵی هۆڤیانە بوو، بۆیە بیر لێكردنەوە زێدە دژوار بوو. سەركردایەتی جڤاتی جولەكە لە هەموو گیتوكان كۆششیان بێوەچان بوو تا بواری بەرهەڵستی نەبێ وبیریش لێنەكەنەوە. بۆ نمونە جاكوب جینسی سەرۆكی جڤاتی جولەكە لە ڤیلینیوس لە لیتوانیا وتارێكی لە 15ی مایو/ئەیار/1943دا بۆ هەموو بەرپرسەكانی گیتوی ئەوێی روون كردەوە كەوا گستابو جولەكەیەكی دەستگیر كردووە بە تاوانی ئەوەی دەمانچەیەكی كڕیبوە و هەڕەشەی كرد(( نازانم ئەو كێشەیە هەتا كێندەرێ دەڕوات و جارێ رابردوو كۆتاییەكەی بۆ گیتو باش كەوتەوە، بۆیە هوشیارتان دەكەمەوە ئەگەر ئەم جارە شتێكوا دووبارە ببێتەوە ئەوا هەمووتان بە یەكەوە سزا دەدرێن و سزاكەش پیری تەمەن شێست سالآن و منالآنیش دەگرێتەوە....بیر بكەنەوە ، ئایە ئەمە ئەو گیانبازیە دەهێنێ؟)) یەك وەلآم هەیە ، ئەویش ژیرانە بیر بكەنەوە ئەم كارە ئەو گیان بازەی دەوێت!!! بەرپرسی گیتوكانیتر ویستیان هاوكاری ئەوانە بكەن كە نیازیان بەر هەڵستی یە.

هەڵوێست هەر چۆن بوایە كاریگەری لە سەر زۆربینەی خەڵكەكە نەبوو، چونكە دەستەڵاتی باڵآی ئەڵمانیەكان زۆر بە هێز بوو و جولەكەش دابڕاو و چەوساوە بوو. بۆیە دەرئەنجام هەر وەك جاران بوو جا چ مرۆڤ خۆی لە گەڵ مەرجەكانی ئەڵمانیەكان ساز كردبایە یان بەرهەڵستی كردبایە.

## مردن لە سەر شەقامەکان

مردن باڵی بە سەر گیتو لە شوێنێکدا کێشابوو، برین پێچ (( ئەدینا بلادی شفایگر )) وا باسی ژیانی هاوینی ساڵی 1941 گیتو دەکات (( پاش سێ هەفتە گەرامەوە نەخۆشخانەکە...... بۆ بەشی تیفوی ماك بۆ لای ئەو منداڵانەی هێشتا نەمردوون. منداڵە نەخۆشەکان دوو دوو لە سەر یەك قەرەوێڵەیەکدا درێژ کرابوون. پلێتەی پلاستیکیان بە نێو چەوانیان لکێنرا بوو و پلێتەکە ژمارەیان لە



منداڵێکە لە سەر شۆستەی گیتوی وارشۆ کەوتووە و رووحی دەدا، لە 19ی سپتمبر/ئەیلول 1941 وێنەگرەکە نوسیویەتی: (( خەڵکەکە بەس لێیان گوزەر دەکەن و زۆری وەك ئەومناڵە هەیە)).

سەر بوو. پلەی گەرما بەرز بوو، بەردەوام داوای ئاویان دەکرد، نەخێر بە هۆی تیفوی ماك نەمردن، ئێمە لە نەخۆشخانە دەرمانکردن ، زۆر ماندوو ببووین ڕۆژانە دە منداڵی تازەمان بۆ دەهات . بۆیە ڕۆژانە هەمان ژمارەمان دەردەکرد یان ڕاینگوازینەوە لە بەشی (( گومان لێکردن )) بۆ بەشی (( ئاسایش )) بێگومان ئەڵمانیەکان خۆیان وردبینی دۆسیەکانی نەخۆشەکانی تیفوی مارکیان دەکرد. ئێمە دەرمان دەکردن بۆ ئەوەی یان لە ماڵەکانیان لە پرسانا بمرن یان بە پەنداوی بێنەوە و بۆ دواجار ماڵئاوایان لێ بکەن، ئەوەش ڕۆژانە ڕووی دەدا.

ئەڵمانیەکان هێشتا دوور بوون کە بتوانن حکومەتی فەرنسی لە ڤیش ناچار بکەن کە مامەڵەی ڕەگەزپەرستی لە گەڵ جولەکە فەرنسیەکان بکەن، بەڵام سڵیان نەکردەوە لە دەرکردنی یاساکانی دژ بە جولەکە، کە گرتنی بە کۆمەڵی جولەکەکانی فەرنسی لە ناوەندی یولیو/تەمموز 1942دا دەستی پێکرد و پۆلیسی فەرنسی جێبەجێیکرد. لەو 80 هەزار جولەکانەی ڕەوانەی ئوردوگاکانی فڕکردن کران 10٪ یان تەمەنیان لە سەرووی 60 ساڵان بوو و منداڵانیش لە تەمەنی لە ژێر شەش ساڵان 10٪ بوون. دەسەڵاتدارانی فەرنسی دریغیان نەکرد لە یارمەتیدانیان تا هەموو ئەو جولەکانەی (( ئەزادی بێگانەیان پێوە بوو )) ئاوارە کرد، چونکە بۆ ئەڵمانیەکان زۆر زەحمەت بوو جولەکەکان بدۆزنەوە تا ئاوارەیان بکەن. بە شەو و بە ڕۆژ بە گوللە سواری لۆرییەکانیان دەکردن، هەر ئۆهەمد کەسیان لە یەك لۆری دەکرد و ژنێك لە گەڵیان سواردەبوو، سێ چوار پێنج منداڵی پێبوو، تەمەنی منداڵەکان لە نێوان 15 مانگ هەتا 13 ساڵان بوو. منداڵەکان ئەوەندە پیس بوون ناگێردرێنەوە. جەستەی سێ چوار منداڵەکە هەموو برین و گێنم بوو، جۆرێك خورشتی پیسیان هەبوو، زۆریان دەویست تا پشکنینیان بکرێت، بەڵام تەنیا هاوسۆزی بەرپرسی ئوردوگاکەمان سەرکردە کوەن مان هەبوو کە بێ وێنە بوو. یەکسەر کەرەستەکانی شوشتنمان ئامادەکرد. چوار خاولیمان هەبوو هەر ئەوەندەمان هەبوو، بۆ هەزار منداڵ.

ئودیت دالتروف . باتیسی . ژنێکی گیراو لە درانس . ئوگست 1942 سەبارەت بەو منداڵانە جولەکانەی کە گەیشتنە درانس کە لە ئوردوگاکانیتری کۆکردنەوە ڕەوانە کرابوون.

## فڕکردن له شوێنەکانی تری ئەوروپا

له رووی پراکتیکەوە هەموو قۆناغەکان وەك یەك بوون هەر لە دەست نیشانکردن و کۆکردنەوە و ئاوارە کردن و دواییش فڕکردنەکە ، بەڵام فڕکردنەکە لە وڵاتێك بۆ وڵاتێکی تر جیاوازی هەبوو، گەرچی هەنگاریا هاوپەیمانەکانی ئەڵمانیای نازی بوو بەڵام جولەکەی ئەم وڵاتە تا ساڵی 1944 بە هێمنی ژیان و ژمارەیان بە جولەکە لایەدەکانی ترەوە کە لە وڵاتانی ترەوە روویان تێیکرد یەك ملیون جولەکە دەبوون. سەرکردایەتی هەنگاریا پەیرەوی زۆری یاساکانی دژایەتی جولەکەی کرد بەڵام هەرەشەی نازیەتیان قبوڵ نەکرد بۆ رەوانەکردنی جولەکەکان بۆ ئوردوگاکانی فڕکردن. بەڵام بە داگیرکردنی هەنگاریا لە مارسی/ئاداری 1944 لە لایەن سوپای ئەڵمانیەوە لە ناوەراستی مایو/ئەیاری 1944 گواستنەوەی جولەکەی هەنگاریا بۆ ئوشفیتز دەستی پێکرد. بە 42 رۆژ زیاتر لە 420 هەزار جولەکەی هەنگاریان راستەوخۆ گواستەوە ئوشفیتز - بیرکناو و لە پێش چاوی هەموو جیهانا رۆژانە بە فرنەکانی گاز 12 هەزاریان دەکوژران.

لە سەرەتای یولیو/حوزیران 1944دا سەرۆکی حکومەتی هەنگاریا میکلوس هورس فەرمانیدا دەرکردنی جولەکە راگیرێت و ئەم هەنگاوەش هاوکاری هەنگاریای دەویست بۆیە توانیان گیانی 300 هەزار جولەکە لە بودابست رزگار بکەن. ئەوەش بە پشتیوانی وڵاتانی بێلایەنی وەك سوید و سویسرا و ڤاتیکان لە رووی دبلوماسی پەیدا کرابوو. بەڵام لە کۆتایی ساڵی 1944دا لە بودابستدا 30 هەزار جولەکە گیانیان لە دەستدا. ئەوەش لە پرۆسەی (( خشینی مردن )) بەرەو سنووری نەمسا یان بە کوشتنی نازییە هەنگاریەکان بوو.

وەك هەنگاریا ئیتالیاش یاساکانی دژ بە جولەکەی دەرکرد بەڵام جولەکە کەمینەکەی ئەم وڵاتە تا رووخانی حکومەتی بنیتو موسولینی فاش لە یولیو/حوزیرانی/1943 لە راونان پارێزراو بوون.

هێزەکانی ئەڵمانیا بە هاوکاری ئیتالیا دژ بە سامیەکان توانیان لەکۆی 35 هەزار جولەکەی ئیتالیا 8 هەزاریان کۆ بکەنەوە و رەوانەی ئوردوگای قڕکردنیان لە ئوشفیتز ـ بیرکناو بکەن.

بە داگیرکردنی یوگوسلافیا لە لایەن ئەڵمانیاوە کرا بە چەند پارچە لە ئەپریل/نیسانی 1941 و ئەو کاتە نزیکەی 80 هەزار جولەکەی تێدا دەژیان و جولەکەی سربیا ژمارەیان 16 هەزار جولەکە دەبوو کە لە شاری بلگرادا بوون.

ئەڵمانیەکان سامانەکانیان لێ زەفتکردن و ناچاریان کردن کاری بە زۆریش بکەن. لە ئوگست/ئاب/1941 شاڵاوی گرتنیان دەست پێکرا و بەشی زۆری جولەکەی سربیا کوژران. لە بەهاری 1942دا لە ئوردوگای سملینی نزیك بلگراد عارەبانەی کوشتنی بە گازیشیان بۆ کوشتنیان بەکار هێنا، هەتا هاوینی 1942 دا سەدان جولەکەی سربیا لە ژیاندامان.

حکومەتی کرواتیای فاشی، ئوستاشا، لە شەڕدا هاوپەیمانیەتی لە گەڵ ئەڵمانیادا راگەیاند و جولەکەی ناچار کرد ئەسرەگەزی داود هەڵگرن و سامانەکانیان زەفتکرا، حکومەت بە بەرنامە سرب و جولەکە و قەرەجی لە ئوردوگاکانی گرتنی یاسنۆڤاکدا هەزارەها سرب و بیست هەزار جولەکەی لە کۆی 30 هەزار جولەکەی وڵات کوشتن. بە کۆتایی ئوکتۆبەری 1941 زۆربەی جولەکەی کرواتیا کوژرابوون و دوایش 7 هەزار جولەکەشی ناوارەی ئوشفتیز کرد، کۆی ژمارەی کوژراوی جولەکە لە یوگوسلافیا گەیشتە 60هەزار جولەکە.

کە ئەڵمانیا و ئیتالیا وڵاتی یونانیان داگیر کرد جولەکەکانی بەشی ئیتالیاکەی هەتا ساڵی 1944دا بێ کێشە و هێمنانە دەژیان، بەڵام لە ناوچەکانی ژێر دەستەڵاتی ئەڵمانیەکان تەنیا لە شاری سالۆنیکیدا کە ژمارەی جولەکەی دەگەیشتە 50 هەزار پرۆسەکانی قڕکردنیان گەیشتێ، لە نێوان مانگی مارس/ئادار و ئەبریل/ نیسانتدا لە ساڵی 1943دا زیاتر لە 40 هەزار جولەکە ناوارەی ئوشفتیز ـ بیرکناو کران و بە کۆتایی شەڕەکە تەنیا هەزار جولەکە گەرایەوە سالۆنیك.

سەرکردەکانی بولگاریا داواکانی ئەڵمانیایان بۆ ناوارەی کردنی 50 هەزار جولەکەی ئەو وڵاتەیان رەتکردەوە و لە بۆگەنی شەڕەکە رزگاریان بوو. بەڵام

بولگاریا سەرپێچی ئەکرد لە ئاوارەکردن و دەرکردنی ئەو جولەکانەی هاوڵاتی نەبوون، کە ژمارەی ئەو جولەکانەی لە ناوچەکانی تراکییە و مقدونیای ژێر دەستەڵاتی بولگاریا کە رەوانەی تربلینکا کران گەیشتە 11 هەزار کەس.

پێش هەڵگیرسانی شەڕ لە رۆمانیادا 750 هەزار جولەکە دەژیان، 300 هەزاریان لە ناوچەکانی بیسارابین و ترانسینستریین دەژیان. جولەکەی ئەم ناوچانە لە برسان یان بە دەستی هێزەکانی رۆمانیا بە یارمەتی ئەڵمانیایەکان کوژران، ژمارەیان کە تا کۆتایی ساڵی 1942 کوژران لە 200 هەزار کەس زۆرتر بوون و لە ناوچە ناوەراستەکانیشدا 300 هەزار جولەکە رزگاریان بوو. گەرچی رژێمی رۆمانی بە سەرکردایەتی مارشاڵ ئەیون ئەنتونیسکو دژایەتی جولەکەی دەکرد.بەڵام رازی نەبوو رەوانەی ئوردوگاکانی قڕکردن بکرێن.



## کۆکردنەوە لە وڵاتانی باکووردا

رەگەزپەرستی دژ بە جولەکەی نەرویج پاش گرتنی وڵاتەکە لە لایەن ئەڵمانیاوە لە 9ی ئەبریل/نیسانی ساڵی 1940 دەستی پێکردن گەرچی سەرژمێریان هەر دوو هەزار جولەکە دەبوو بەڵام ئەڵمانیەکان چاویان تێبڕیبوون، لە کۆنگرەی وانسیی بەستراو لە یەنایر/کانوونی دووەم 1942 لیستی ئەو وڵاتانە ئامادە کرا کەوا جولەکەی تێدا نیشتەجێیە و داواش کرا پەلەو دەست و برد بکرێ لە پێش جێبەجێ کردنی (( دوا چارەسەری بۆ کێشەی جولەکە )) هەر لە هەمان مانگدا باس لە دەست نیشانکردنی جولەکەکانی نەرویجیش کرا. بەڵام گرتن و راونانیان تا پایز دواکەوت و لە ئوکتۆبەر/تشرینی یەکەمی 1942دا سەدان پیاوانی تەمەن لە سەرووی 16 ساڵیدا لە شارەکانی تروندهایم و بێرگن و ئوسلو گرت و رەوانەی ئوردوگاکانیان کردن و سامانیشیان زەفتکرا. هەروەها لە شەوی 26ی نوڤمبر/تشرینی دووەم ژن و منداڵە جولەکەکانیشیان گرت و نزیکەی هەزار کەس خۆی نەداتە دەست و توانیان بەرەو سوید رابکەن.

حکومەتی دانیمارک رازی نەبوو هاوڵاتیانی جولەکەی خۆی کە سەرژمێریان 7500 کەس دەبوون مامەڵەی جیایان لە گەڵ بکات، سێ ساڵ ئازادانە ژیان بەڵام لە ئوگست/ئابی 1943دا هتلر بڕیاری دا کاتی جولەکەی دانیمارک هاتووە و هەواڵەکە بە دزە گەیشتە ئەوێ بۆیە هەموویان بە یارمەتی ماسیگرە دانیمارکییەکان و سویدییەکان دەربازی سوید بوون. حکومەتی دانیمارک وازی لە ئاوارە و دوور خراوەکانی خۆی لە ئوردوگای تێریزنیشتاد نەدەهێنا و چاودێری دەکردن بۆیە لە ژیاندا مان و بە کۆتایی هاتنی شەڕەکە گەرانەوە دانیمارک.

جولەکەکانی فنلنداش کە ژمارەیان دوو هەزار کەس دەبوو دوور نەخرانەوە و سەرکردەکانی فنلندی نەیاندانە دەست نازییەکان.

22ی مارس/ئادار

قەدەغەکردنی چونی منالآنی قەرەج بۆ خوێندنگا ئەڵمانیەکان.

30/مارس/ئادار

هتلر ئاگاداری ژەنراڵەکانی کردەوە کەوا شەڕی داهاتوویان دژی روسیایە و شەرەکە(( شەڕی قڕکردنە)).

22/ی یونیو/حوزیران

هێرشی ئەڵمانیا دژ بە یەکێتی سۆڤیەت کرا. دەستەکانی ئینستاز لە ناوچەکانی خۆرهەڵاتی پۆلونیا دەستیان بە کۆمەڵ کوژیەکان کرد. روبرت لی یەکێك لە سەرکردەکانی نازییەکان لەلێدوانێکی ئەو رۆژەدا ووتی: (( جولەکە دوژمنی دێرینی بووە و هەر بە دوژمنی دەمێنێتەوە چونکە هەموو هەوڵێکی داوە بۆ داگیرکردن و بۆگەنی میللەتەکامان بۆیە دەبێ خەبات بکەین بۆ تەواوی قڕکردنیان و قڕیشیان دەکەین، دەمانەوێ ئازاد بین، نەك هەر لە ناوەوە بەڵکو لە دەرەوەش)).

31 یولیو/تەمموز

مارشاڵ هرمان گوزنگ دەستەڵات دەداتە سوپاکانی ئەس ئەس بۆ کار کردن بۆ ئامادە کردنی (( چارەسەری بنەرەتی کێشەی جولەکە))

1 سپتمبر/ئەیلول

دەبێ جولەکەی تەمەنی لە سەرووی شەش ساڵییە ئەسرەگەزی زەرد هەڵگرێ.

18/ سپتمبر/ئەیلول

دەبێ جولەکە داوا پێشکەش بکەن بۆ وەرگرتنی مۆڵەت بۆ گەشت بە هۆیەکانی گواستنەوەی گشتی.

29 ـ 30/ سپتمبر/ئەیلول

دەستەیەك لە ئینساتز 33 هەزار جولەکەیان لە نزیك خەرەندی بابی یا کوشت.

15 ئوکتۆبەر/

کۆچ کردنی جولەکە لە ئەڵمانیەوە قەدەغە کرا.

نوڤەمبر/تشرینی دووەم

گیتو/ ئوردوگای گرتن تایبەتە بۆ (( کۆمەڵگای جولەکەی نموونەی )) و شیاویش بێ لە بەر چاوی پشکێنەرانی خاچی سوور.

7 دیسمبر/ کاوونی یەکەم

هێرشی یابانی بۆ سەر بیرل هاربر. بەشداری کردنی ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ شەڕەکە.

8/ دیسمبر/ کاوونی یەکەم

جێبەجێ کردنی یەکەم پرۆسەکانی لە سێدارەدانی جولەکە بە گاز لە ئوردوگای قڕکردن لە شیلمنو لە پۆلونیا.

11/ دیسمبر/ کاوونی یەکەم

راگەیاندنی ئەڵمانیا شەڕ دژی ولایەتەیەککرتووەکانی ئەمریکا.

12/ دیسمبر/ کاوونی یەکەم

قەدەغە کردنی جولەکە لە بەکارهێنانی تلفۆنە گشتیەکان.

1942 20 نیایر/ کانوونی دووەم

راینهادر هایدرش سەرۆکایەتی ئاسایشی ئەس ئەس لە کۆنگرەی ڤانسی دەکات لە یەکێك لە ناوچەکانی دەورووپشتی پاریس بە ئامادەبوونی گەورە بەرپرسانی نازییەکان بۆ ڕێکخستنی (( دوا چارەسەری )). ئاوارە کردنی جولەکە و قەرەج لە گیتوی لودز بۆ ئوردوگای شلمینو بەردەوامە.

15 فیرایر/شوبات

کوشتنی دەستەی یەکەمی جولەکە بە گازی زیکلون بی لە ئوردوگای ئوشڤیتز جێبەجێ کرا، بەخێو کردنی ئاژەڵی ماڵی لە جولەکە قەدەغە کرا.

17 مارس/ ئادار

یەکەم لە سێدارەدانی بە کۆمەڵ و بە گاز لە ئوردوگای قڕکردنی بلزك لە باشووری خۆرهەڵاتی لوبلین کرا.

20/مارس/ئادار

ژوورەکانی گاز لە ئوشفیتز ـ بیرکناو بە کار هات بۆ ئەم مەبەستە دوو خانویان ئامادە کردبوو، جولەکەی پۆلونی لە ئوبرشلسایین یەکەمین قوربانی بوون.

ئەبریل/ نیسان ـ مایو/ئەیار

کردنەوەی ئوردوگای قڕکردن لە سوبیبور.

4 مایو/ئەیار

یەکەم پرۆسەی دەست نیشان کردن (( لە نێو گیراوەکاندا کرا لە ناو ئەوانی چەند مانگێك بوو لە ئوشفیتز ـ بیرکناو مابوونەوە. ئەوانەیان بۆ ژوورەکانی گاز نارد کەوا(( کەڵکی نیشیان نەماوە)).

12 مایو/ئەیار

جولەکە قەدەغە کران بچنە سەرتاشخانەی (( ئارییەکان )).

مایو/ئەیار ـ یونیو/حوزیران

جولەکەی ئەوروپای خۆرئاوا ناچار کران ئەسرەگەزی زەردی داود هەڵگرن.

12/ یونیو/حوزیران

دەبێ جولەکەکانی ئەڵمانیا هەموو کەلوپەلی کارەبایی و چاویی و چەرخلاری و ئامێری چاپ دابنێن.

1 یولیو/تەمموز

لەمەودوا هەموو منالآنی جولەکە لە خوێندن قەدەغە دەکرێن.

4/ یولیو/ تەمموز

یەکەم پرۆسەی (( دەست نیشانکردن )) لە شۆستەی بەتاڵکردنی ئۆشفیتز کرا و ئەم دەستەیەش لە جولەکەی سلۆفاکیا بوون.

7/ یولیو/ تەمموز

هاینرش هیملر دانوستانی لە گەل دکترو کارل کلاو بیرگ کرد و هێتر لە سەر مەسەلەی نەزۆککرلنی ژنانی جولەکە کەوا ئوردوگاکە لە خزمەتی ئەودایە بۆ کردنی تاقیکردنەوە لە سەر گیراوەکان.

10/ یولیو/ تەمموز

کلاو بیرگ ئاگادار کرایەوە کەوا هیملر دەخوازێ بچێتە رافزسبروك و دەست بە کار بێ نەزۆککردنی ژنانی جولەکە و ویستی بزانێ نەزۆککردنی هەزار ژنە جولەکە چەند کاتی دەوێت.

16. 15 یولیو/ تەمموز

گەیشتنی یەکەم دەستەی جولەکەی هۆلندی بۆ ئوشفیتز.

18 . 16 یولیو/ تەمموز

پۆلیسی فرنسی لە پاریس 13 هەزار جولەکە (( بێ ولاتەکان )) ی گرت لە وانە نۆ هەزاریان کە چوار هەزاریان منالْ بوون رەوانەی ئوشفیتز کران.

19/ یولیو/ تەمموز

هیلمر فەرماندا کەوا لە کۆتایی سالْدا جولەکەی پۆلونیا تەواو دەبن.

30/ یولیو/ تەمموز

رێکخراوە جولەکەکان دەبێ هەموو گەنجینە دێرینەکانی دروستکراو لە میتالی گران دابنێن.

22/ یولیو/ تەمموز . 12 سپتمبر/ئەیلول

پرۆسەکانی ئاوارە کردنی بە کۆمەلْ لە گیتوی وارشۆ بۆ ئوردوگای تربلینکا.

19 ئوکتۆبەر/ تشرینی یەکەم

جولەکەی ئەلْمانی قەدەغەکران کەوا لە کتێبخانەکانی (( ئاری )) کتێب بکرن.

26 نوفمبر/ تشرینی دووەم

ئاوارە کردنی جولەکەی نرویجی بۆ ئوشفیتز.

18 دیسمبر / کانوونی یەکەم

هاوپەیمانەکان رایانگەیاند هەر کەسێ جولەکەیەك بکوژێت پاش شەرەکە سزا دەدرێت.

## رێنماییەکانی دەستەلاتی پۆلیسی ناوخۆیی لە سازوالزاس

1ـ تەنیا جولەکەی راستەقینە دوور بخرێتەوە. مشلنجەکان ناگرێتەوە، ئەو پیاوانەی بە ژن تێکەلْبوون و هەروەها جولەکە بێگانەکان بە مەرجێ هاولاتی

وڵاتانی نەیار نەبن یان ئەو وڵاتانەی کە لە لایەن ئێمەوە داگیرنەکراوە. ئەو جولەکانەی لە بەر هۆی هەڵوێست وەرگرتن بێ وڵاتن دەگیرێن. هەموو جولەکەیەك دەکرێ بگوازرێتەوە بێجگە لەو جولەکانەی شەڕن و لە سەر جێگا کەوتوون.

2. بۆ جولەکەکان شوێنی کۆکردنەوەیان لە لودڤیجسەهافن، کایسر سلاوتن، لانداو بۆ ساز کراوە و بە پاس دەگوازرێنەوە ، لە هەر پاسێکدا فەرمانبەرێکی تایبەت بەرپرسیار دەبێ و چەند پیاوانی پۆلیسی رەسمی و گەر پێویست بوو چەند فەرمانبەر لە ژێر فەرمانیاندا دەبن.

3ـ ئەو فەرمانبەرە بەر پرسە لیستی ناوەکان لە شوێنی کۆکردنەوەکەدا وەردەگرێت و لە لیستەکەدا دیارە بە کام پاس دەڕۆن و سەرباز و هاوکارەکانی کێن کە لە ژێر فەرمانی ئەودا دەبن. هەروەها ناو و ئەدرێسی ئەو کەسانەشی تێدا کە دەستگیر دەکرێن.

5. کە بەرپرسەکان زانیاریەکان لە سەر جولەکەکان وەردەگرن بەرێ دەکەون بۆ شوێنەکانی نیشتەجێیان و ئاگاداریان دەکەنەوە کەوا دەگیرێن و دوور دەخرێنەوە و بۆیە دەبێ لە ماوەی دوو سەعاتدا خۆیان بۆ سەفەر ئامادە بکەن. گەر شتێك هاتە پێش دەبێ سەردانی بەرپرسەکە لە شوێنی کۆکردنەوە کە بکەن و ناکرێ خۆ ئامادەکردنی دوا بخرێت.

6. گیراوەکە ئەگەر کرا بۆی هەیە ئەم شتانە لە گەڵ خۆیدا بێنێ،

ا بۆ هەر جولەکەیەك هەیە یەك جانتای سەفەر بێنێ و پێویستیەکانیان تێدا بێ و کەسی گەورە دەکرێ 50کغم بێنێ و بۆ منداڵیش 30کغم دەبێ.

ب ـ یەك دەست جل و بەرگ.

ج ـ بۆ هەر جولەکەیەك یەك بەتانی.

د ـ تێشو (( خواردن و ئاو )) بۆ چەند رۆژ.

ه ـ قاپێك و چەنگاڵ و کەوچك و چەقۆیەك.

و ـ هەر کەسێ سەد مارکی (RM) زیاتری پێنەبێ.

ز ـ پەساپۆرت و هەویە و پسولەی کەسایەتی دەرهێنانیان ئاسان و بەردەستدا بن و لە ناو جانتا نەبن.

7 . بۆیان نیە ئەم شتانە لە گەڵ خۆیان بێنن: دەفتەر شەك و شەك و سەهم و خشڵ و گەنجینە و پارەش لە سەد مارك زۆرتر نەبێ.

(..... )

9 . پێش جێ هێشتنی خانوەکانیان دەبێ ئەم فەرمانانە کرابن.

ا . گیانلەبەرە ماڵییەکان و گیانلەبەری‌تری زیندووی وەك ( سەگ ، پشیلە، باڵندەی ناو قەفەس ) بدرێتە سەرۆکی شارەوانی ، سەرکردە ناوخۆکان. گەورەی گوندەکە یان هەر کەسێکی شیاو و بەرامبەری پسولەیەك وەرگرێت.

ب . کاڵای تەڕ بدرێتە (NSV) نوسینگەی خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی سەر بە حیزبی نازیی.

ج . ئاگر و ئاگردان بکوژێندرێتەوە.

د . ئاو و گاز بگیرێتەوە .

ه . فیوزەکانی کارەبا هەڵگیرێت.

و . کلیلەکانی خانووەکە بە یەکەوە ببەسترێت و ناوی خاوەنەکەی و گوند و شارەکە و شەقام و ژمارەی خانووەکەی لە سەر بێ.

ز . دەبێ کەسەکە ورد بپشکێندرێت نەوەك چەك و زەخیرە و تەقەمەنی و زەهرە و پارەی بێگانە و خشڵ و شتی‌تری پێ بێ.

(.... )

13 . بە شێوەیەکی راست هەڵسوکەت لە گەڵ جولەکە گیراوەکە لە کاتی گرتنیدا بکرێت و ئەمەش زێدە گرنگە و نابێ توندی رەفتاری بە هیچ شێوەیەك لە گەڵ بکرێت.

## ئاوارە کردن

بۆ قڕکردنی جولەکە پێویست بوو ئەو ملیونەها جولەکەی ئەوروپا دوور بخرێتەوە. ئەڵمانیەکان لە بەر چەند هۆیەك بڕیاریاندا جولەکە لە زێدی خۆیان نەکوژن، بەڵکو هەموویان بۆ ئوردوگاکان بگوازەوە کە لە پۆلوینا بۆ ئەم مەبەستە دروستکرا بوون. هتلر و سەرکردەکانیتر دەیانویست بە نهێنی بیانکوژن. چونکە نەدەگونجا لە بەر چاوی هاوڵاتیانی لە خۆرئاوا و ناوەراست و خوارووی ئەوروپا بیانکوژن تا یارمەتی هاوڵاتیان لە دەست نەدەن. بۆ کوشتنی ملیونەها جولەکەی پۆلونیا و بەشە گەورە داگیرکراوەکەی یەکێتی سۆفیەت ئەڵمانیەکان دوور خستنەوەیان بۆ ئوردوگاکانیان پێباشتر بوو کە لە رووی پراکتیەکەوە لە گوللە بارانکردنیان و کوشتنیان. بوونی هێڵی ئاسنی پوخت لە ئەوروپادا گواستنەوە و دوور خستنەوەی جولەکەکانی بۆ پۆلونیا ئاسانکرد و لە پێش چاوی هاوڵاتیانیش گوم دەبن و شوێنەواریان نامێنێ ، ئەگەر ئەو جولەکانەی لە گرتووخانەکانی ئوشفیتز - بیرکناو کە ژمارەیان لە ملیۆنێك زۆرتر دەبوو زوو بە زووری گاز نەکوژرابان ئەوە ئەم شوێنە بچوکە دەبوایە گەورەترین شاری ئەوروپا.

لە ئوکتۆبەر/تشرینی یەکەمی 1940دا حەت هەزار و پێنج سەد جولەکە لە بادن و ساری ئەڵمانیا بۆ ئوردوگاکانی خوارووی فرنسا دوور خرانەوە. بە تەمەنترین کەسیان 97 ساڵ دەبوو کە پیاوێکی کارلسروە بوو، دوایی زۆربەیان لە فرنساوە بۆ پۆلونیا دوور خرانەوە، بۆ دوور خراوەکان مۆڵەتی کاتی تەنیا 15 دەقیقە تا دوو سەعاتیان بۆ دانان تا ماڵەکانیان چۆڵ بکەن . بە پێی راپۆرتی پۆلیس هەندێکیان (( ئەم مۆڵەتەیان بە هەل زانی بۆ رزگار بوونیان خۆیان کوشت )).

لــه 25ی ئــهبریل/نیــسان 1942 (( بهرەوخۆرهــهلات )) 995 جولەکــەی دانیشتووی فورزبورگی ئەلمانی لە ژێر چاودێری پۆلیس و سەربازدا ئاوارە کرد. ناچار کران هــهموو ســهرمایه و مالّیـان جـێبهێلّن بێجگـه لـه هەنـدێ شـتی (( پێویـست )) نـهبێ ، ناچـاریش کـران هەنـدێکیتر کەلوپـەلیان لـه ئیستگەی شـەمەندەفەری فورزبـورگ جـێبهێلّن ، ئـەم کەسـانە بـۆ ئوردوگایـەکی کـاتی لـه تراڤنیکی و ئەزبیکا گوازرانەوە و لەوێشەوە بۆ ئوردوگای فڕکردن له بلزك.

## ئومشلا جپلاتز

ئومشلا جپلاتـز Omschlagplatz شـوێنێکە بـۆ دووبـارە بارکردنەوەیـە و سەر بە گیتۆیە، زۆرجار گۆڕەپان یان جێگایەکی کراوە بوو و زۆر جار ئەم شوێنە بۆ کاری دەست نیشانکردن بە کار دەهات، کە دوا چارەنووسی ئادەمیزادی لێدیار دەکرا کە بەرەو مردنی دەبەن یان دەکرێ بۆ کار (( بە کار بهێنن )) بە زۆری ئەم شـوێنانە لـە گیتـو گـەورەکان لـە نزیـك هێڵـەکانی سـکەی ئاسـنین بـوون. بـۆ ئاسانکردنی پرۆسـەکانی ئـاوارە کـردن لـە وارشـۆ سکەی ئاسـنینی یەدەگ هـەبوو دەگەیشتە ئومشلا جپلاتز. لە 23ی یولیو/ تەمموزی 1942 دەستکرا بە ناردن و دوور خـستنەوەیان لـە وارشـۆ وە بـۆ تربلینکـا، لـە نـاو گیتـودا رۆژانـە هـەزارەها جولەکـە کـۆ دەکرایـەوە، کـۆ کردنـەوەی جولەکـە کارێـك بـوو بـە زۆر لـە لایـەن (( خزمەتگوزاری بۆ رێکخستن ))ی جولەکە خۆیان بە بەشـداریکردنی هێزەکـانی ئـەس ئـەس و هێزەکـانی ئـۆکرانی و لاتڤـی و لیتـوانیی هاوکـار ئـەنجام دەدرا. دەبوایە رۆژانە 6. 7 هەزار جولەکە کۆ بکرێتەوە ، وای لێهات جولەکەکان خۆیان بـەوە هـەڵ دەخەڵەتانـد گوایـە بـە چـوونیان بـۆ ئومـشلا جپلاتـز نانیـان دەسـت دەکەوێت. ماڵەکان و شەقامەکان چۆڵکرا و زۆر کەسیش بە رێکەوت دەگیران.
لە بەرواری 5 یان 6ی ئوگست/ئاب دکتـۆری فێرکاری یـانوس کـورزاك و دووسـەد منالّ لەو هەتیوخانەیەی کە بەرێوەی دەبـرد بـۆ تربلینکـا دوور خرانـەوە. دکتـۆر کورزاك نەیویست بە هۆی ئەوەی کە رەگەزی (( ئارییە )) خۆی رزگار بکات و لـە منالّەکان جیـا بێتـەوە لـە پێشەوەی کاروانەکە بـە نـاو شـەقامەکانی گیتـو بـەرەو ئومشلا جپلاتز رۆیشت و منالّێکی لە باوەش بوو و دەستی یەکێکیتری گرتبوو.

خەڵکەکە لە تومشلا جیلاتز چەند رۆژ چاوەڕێیان کرد چۆڵ بێت. بەڵگەنامەی پارێزراو زۆرن سەبارەت بە رەوشە ترسناکەکانی شوێنی چاوەڕێ ئەم مرتنە ماون. هەتا ناوەراستی سپتمبر/ئەیلول ژمارەی ئەو کەسانەی رەوانەی ئوردوگای فڕکردن کران لە ئومشلا جیلاتز گەیشتە 250 هەزار کەس و دوا کاروانەکان هاوکات بوو لە گەڵ یاخیبوونەکەی گیتو کە لە ئەبریل/نیسان و مایو/ئەیاری ساڵی 1943 رووی‌دا. ئەو کاتانە وارشۆ لە هاوڵاتیە جولەکەکانی چۆڵ کرابوو.

## شوێن بۆ خوێن و فرمیسك

هالینابیرنباوم جی بە چاوی خۆی لە ئومشلاجیاتز بینیوە پاش رزگار بوونی لە فڕکردن گێرایەتەوە. (( ئێمەیان بۆ ئومشلاجیاتز هاژووت سەد لەعنەتی لێبێ، تەڕ بە خوێن و بە فرمێسك، هەوا بە ناو فیتەی تیژی شەمەندەفەرەکاندا گوزەری دەکرد ئەوانەی سەدان هەزارجولەکەی بۆ دوا مەنزڵگەی ژیانی دەگواستەوە.

گۆرەپانە گەورەکە کە لە تەنیشت بینایەك بوو کە پێش شەڕ خوێندنگا بوو، لە خەڵکی بێهیوا و داوەشا و جمەی دەهات، زۆربەیان هەتا هێزیان تێدا بوو لە کارگەکانی ناوچە ئارییەکان کاریان پێکرا، بیلتی هاتوچۆیان (Auswies) یان پێبوو، مافی ئەوەیان هەبوو ماوەیەك بژیین. وەك زانراوبوو بە هاورێیەتی هێزەکانی پاسەوانی تایبەت دەچوونە سەردانی ماڵەکانیان کە لە خزم و خۆشەویستیەکان چۆڵکرابوو پاش ئەوەی هەموو سەرمایەکانیان لێزەفتکرا بوو، بەڵام ئیمرۆ لە رێگای چوونیان لە کارەوە بۆ ماڵەکانیان تووشی کەمینێ بوون.

لە نێوان و گیتو و کون‌و کەلەبەنەکانی دیوارێکی بەرز لە نێوان ئێمە و پیاوانی پۆلیسی چەکدار هەبوو (( نازی زۆریان لە ناو نەبوو )) برا گەورەکەم هێشتا لە گەڵ خاڵۆژنم و کچەکەی لە گیتودا بوون ، ئەوان حەزیان نەکرد لە گەڵمان دابەزن بۆ سەر شەقامەکە.

بە پەشۆکاویی چاوەڕێ بووین بزانین چ روو دەدات. هاوکات لە کونێك دەگەراین و باوکم لە باوشی گرتبووین ، یەکەم جار دایکمی ماچ کرد و دوایی براکەم و

ئینجا منیش، توندی گرتین تا دوور نەکەوینەوە، زۆر پەرۆشی دایکم بوو نەی دەویست لە ناپۆرەکە دوورمان بخاتەوە ، چاوی بۆ دەروازەیەك دەگێرا تا بۆ شاردنەوەمان بمانباتە ناو بینایەی خوێندنگاکەی کە پارەمتیدەرانی چاودێری تەندروستی و پیاوانی پۆلیسی جولەکەی تێدا بوو. دەویست لەویَ بمانشارێتەوە تا بۆ ناو عارەبانەکان پالّ نەدرێین.

باوکم لە ترسا داوەشابوو جولەی نەمابوو هەتا رادەیەك بیری لە راکردن نەدەکردەوە. هەر ئەوەندەی پێکرا بلیتی هاتوچۆکەی دەرهێنا، وای مەزندە دەکرد ئەو بلیتە هەمووومان رزگار دەکات، زۆر دەترسا. وای دەزانی گویَ رایەلّ نەبوون بۆ نازییەکان زوو کۆتایی پێدێنێ.

ئێستاش لە نومشلاج هەمان کار رووی دایەوە. دایکم وانەبوو بۆیە من هەر خۆم بەو شۆڕدەکردەوە، ئەو وای مەزندە دەکرد کەوا دەتوانیَ رزگارمان بکات و بڕوای بە خۆی هەبوو (....) سۆزم بەرامبەر دایکم زۆر جیاواز بوو.

هەرگیز فارگۆنی شەمەندەفەرەکان لەم کاتانەدا وەك ئیمرۆ وا لێرە کۆ نەبوونەتەوە، وامان زانی کە دەبیَ ئەمشەو بە درێژایی شەو چاوەڕیَ بین تا شەمەندەفەرەکەی بەیانی دەگات. ئەوەش بواری رەخساند بۆ هەلاّتن بۆ گیتو و بۆ زووریَکی سەرەوەی مالّێك. ئەو کاتە بوو بینیمان نازییەکان تۆپی رەشاشیان لە ناوەندی گۆرەپانەکە دانا و روویان لە ناپۆرەی خەلّکەکە بوو، کەوا نوزەی ترسیان لیَ دەهات.ئەگەرچی دیار بوو چی روو دەدات بەلاّم کەسیَ نەدەوێرا هاواریَ بکات یان بە دەنگی بەرز بگرییێت. کەشەکە تارمایی ترس و زۆری لە سەر نیشتبوو.

من و دایکم و باوکم و هایلك چووینە باوەشی یەك وەك ئەوەی کە یەکەم جارە یەکتری دەبینین. وامان سەیری یەکتری دەکرد(....) وەك ئەوەی بمانەوێت پێش هاتنی تاریکی تەواو پێکەوە بین.

هەموو شتیَ بیَواتا بوو. ئەو شتانەی تا ئێستا خەبات و ژیانمان بۆ کرد. باوکم هەر ئەوەندە بوو نەفسی دەهات.

دایکم وەك ئاسایی خۆی هێمن بوو و هەتا بەرووەمدا بزەی دەهاتیَ.

( مەترسـی ) چـرپاندییە گـوێم. ( مـردن دەگاتـە هـەمووماں، یـەك جـار دەمـرین) ....( بـە یەکەوە هـەموومان دەمـرین، هەسـت بـە تـرس مەکـە، بـەو رادەیەش ترسناك نیە....).

Nicht mehr einsatzfähige Frauen u. Kinder.



ژن و منالآن لـە ئومـشلاجیلاتزی وارشـۆ چاوەرێین بـۆ ئوردوگـای قرکـردن ئـاوارە بکرێن لە تربلینکا. نیابر/ کانوونی دووەم 1943.

پۆلیسی بـرلین یاریـەکانی ئولـومپی مـایو/ئـەیار1936ی کـردە بیـانۆ بـۆ گـرتنـی سـەدان قـەرەج و کـە خۆیـان و خێـزان و گالیـسکە و ولاخو کەلوپەلـەکانیان

دوورخستنەوە بۆ ئەو شوێنەی ناوبراو بە شوێنی پشودانی مارزان کە دەکەوێتە نزیك زبلخانەیەك و گۆڕستانێك. زۆری ئەخایاند شوێنی پشودانەکەیان دڕکەتێل گەمارۆدا. لە راستیدا ئەوە دامەزراندنی ئوردوگایەکی گرتن بدە بۆ قەرەجەکان لە دەورویشتی بەرلین. پاشان هەزارەها هاوولاتی تری قەرەجیان لە مارزن و شوێنەکانی تری پشودان لە نزیك شارەکانی ئەڵمانیا کۆ کردەوە و دواییش بۆ ئوردوگاکانی قڕکردن لە خۆرهەلات.

ساول فریدلندر - یەکێکە لە رزگار بووەکان پرۆفیسور لە مێژووی قڕکردن.

## ئاوارە کردنی قەرەج

بۆ راونانی قەرەجەکان بیانوی ئایدلۆژیان دەدۆزیەوە. سەرکردەی هێزەکانی ئەس ئەس هاینرش هملر بۆچوونی تایبەتی سەبارەت بە بوونی قەرەجی خاوەن (( رەگەزی بێگەرد )) هەبوو و بە ئامۆزای (( ئارییەکان ))ی دەزانی بۆیە دەبێ پارێزگاریان لێ بکرێت. پێویستە ئەوانە دەست نیشان بکرێن و لە شوێنی تایبەتیدا بپارێزین و لە پاراستنگەیان دابنێین. کاری توژینەوەرەکان (( رەگەزی ئاوێتەکراو )) زۆرە و ناتوانرێت بە (( ئارییەکان )) یان بزانرێت، دەرئەنجام زۆربەیان وا دەرچوون. ئەگەر مرۆڤ بکەوتبایە ناو پۆلی هەڵەوە ئەوە دژایەتی بیروکراتی نیشی دەکرد و ئەویش بە دوورخستنەوە کۆتایی دەهات بۆ گیتوکانی جولەکە و لەوێشەوە بۆ ئوردوگاکانی قڕکردن ، ئەوەش باری دەگمەنێتی دەهاتە پێش. تاقیکردنەوەکانی تەندروستی ناوبانگە شوومەکەی کە لە ئوشفیتز دەکرا تەنیا بۆ منالانی جولەکە نەبوون بەڵکو منالانی قەرەجیشی گرتەوە. کەلەوێ زیاتر لە 20 هەزار قەرەج کوژرا.

گوللە بارانێکی دەستە دەستەی قەرەجەکان لە دارستانەکانی خۆرهەلاتی ئەوروپا و دەرەوەی گوندەکان کاری زۆر ئاسایی بوون. کوشتنیان زۆر جار بە دەستی فاشییەکانی ناوچەکە ئەنجام دەدرا. لە ئوکرانیا قەرەجەکان لە ریشە دەرکران. هەتا ئیمرۆش نەزانرا نازییەکان و پارەمتیدەرەکانیان بە ژمارەی راستەقینە چەندیان لە قەرەجەکان لە هەموو ولاتان کوشت. دیارە ئەوەش لە بەر ئەوە بووە کەوا توژینەوەی دروستیان بۆ نەکراوە و هەروەها کەمی سەرچاوە و نەبوونی

سەرژمێری ورد بۆ قەرەجەکانی پێش شەڕەکە و پاش شەڕەکەش. ژمارەکەش بە کەمی مەزندە دەکرێ 200 هەزار بن. بڕوا دەکرێت 25ـ50 ٪ لە قەرەجەکانی ئەوروپا لە کاتی شەڕەکەدا کوژرابن. قەرەجە رزگار بووەکان چ لە ئەڵمانیا یان لە وڵاتانی‌تر هیچ قەرەبوو نەکرانەوە، ئیمڕۆ ئەوان زۆرترین کۆمەڵگەی مرۆڤن کە زۆرترین دووچاری نەژادپەرستی و چەوسانەوەی بابەتی و دژایەتی لە ئەوروپا دەبنەوە.

ئیڤاجوستێن یاریدەدەری روبەرت ریتر (( پسپۆڕ)) ی تەندروستی سەرەکی لە رایخی سێیەمدا لە کاروباری (( ئازاری قەرەج )). سەرەتا ریتر پسپۆر بوو لە تەندروستی دەروونی منداڵان و هەروەها پسپۆڕیش بوو لە (( کاروباری تاوان )) لە بەر رۆشنایی ئەو بیرۆکەیەی کە دەڵێت پاشماوەی بایولوجی بناغەی رەوشتی لاساری و تاوانکارییە. رویتر روونی کردەوە کەوا قەرەج لە بنەرەتدا لە (( رەگەزی ئاری بێگەرد)) ن. بەڵام بە تێکەڵبوونی رەگەزیی خەسڵەتە باشەکانیان گوم کرد لە گەڵ میللەتانی (( نرخ کەمتر )) کە لە گەشتەکانیاندا توشیان دەبوون. بە پێی قسەکەی ئەو ئەم رەوشە وای کرد کەوا رەوشی قەرەج بەرەو و خووڕەوشتی تاوانباری ناکۆمەڵایەتی بچێت. جوستین لە بەر ئەوەی یاریدەدەری بووە بۆیە ئەویش توژینەوەی تایبەتی ئەنجام داوە، یەکێك لەوانە پاراستنی 39 منداڵی قەرەجی بێ دایك‌وباوکی لە حەشارگەی هەتیوخانەیەکی کاسولیکی بۆ ئەنجامدانی بروانامەکەی کە توژینەوەکەی تەواو بووە لە مایو/ئەیاری 1944 منداڵەکان بۆ ئوردوگای فڕکردنی ئوشفیتز . بیرکناو دوور خراونەتەوە و ئەوانە و لە گەڵ ئەو 2900 منداڵە قەرەجی‌تر لە ژوورەکانی گازدا لە شەوی ئوگست/ئاب 1944 کوژران.

ریتر ئەو کارەی بە ئاسانی و خۆشی دەکرد، ئەوان یەك یەك دەهاتن و بە رێك‌وپێکی لە سەر کورسی دادەنیشتن و چاوی منداڵەکان بەراورد دەکرا و لە هەموویان هەمان پرسیار دەکرایەوە و جوستین دادەنیشت و هەموو شتەکانی تۆمار دەکرد. دەبوایە هەموویان زاریان بکەنەوە و ئامێرێکی پێبوو قورگ و کونەکانی کەپوو و کەپووپشتی کەپوو و نێوانی چاوەکانیان و رەنگی چاو و برۆ و گوێیان لە دەرەوە و لە ناوەوە و مل‌وگەردەن و هەردوو دەست (.....) بە

کـورتی هـەموو ئـەو شـوێنانەیان بەورابایـە دەیێـورا. جوزیـف راینهـاردت / فەرەجێکی ئەڵمانی لە لێپرسینەوەکانی (( بیولوژیای رەگەزکان )) دەدوێت.

## لە گەڵ دادگاییکراوەکاندا

پیاوی پۆلیسی جولەکە کالیل بیریشوەنیك ناچار بوو ژن و کیژە بچوکەکەی نـاو ئەو شەمەندەفەرەی بکات رەوانەی ئوردوگای فڕکردن دەکردن، ئەو پۆلیسە وای نووسیوە: خۆت لە ناو فارگۆنی چوارەمی مەروماڵات لە دوای قەتارەکەوە دەبینی و تۆ و دوو پیاوی لێیە ئایە ئەوان ئاگایان لە تۆ دەبێ؟!

فارگۆنەکـە مـشتە لـە ژن و منـاڵ، لـە سەر تەختەدارەکـە و لـە سـەر چینـچکان دادەنیـشی و ئەلوسکاشـی لەباوەشـە، ئایـە کیژەکـە دەرنـگ خـەوی لێ دەکـەوێت؟! ئێستا لە بەر کەمی هەواو لەم شەوەی ئوگست/ئـابی خنکێنـەر دەخنکێـت. تـەنیا لە ناو ئەو دادگاییکراوانەدا دادەنیشی، بێگومان دڵت بەوە دەدەمێیتەوە کەوا تۆ لەم چارەنووسـەدا تـەنیا نیـت. نـا، ئـەوە نیـە کـە تـۆ بـیری لێدەکەمێتـەوە، لـەوێی دادەنیـشیت و ئـەوەی زەحمەتـە کـە لێـی تێبگـەییت، ئـەوە چـۆن دەبـێ و چ روو دەدات!

کالینکای مێروتە ئەوەی دە ساڵ تۆی خۆشویست، ئەوەی زۆر دڵسۆزت بوو، ئەوەی لە بۆچوونەکانت دەگەیشت و زۆریش هیواکانی بە دڵشادییەوە جێبەجێ دەکردی و دەستی لە تۆ بەردا و جێی هێشتی کە سواری فـارگۆنی مـەروماڵات بکرییت و خۆی لێرە بمێنێتەوە(.......).

دەزانم لـە تـوورەیـان خـۆت دەکوشـیت و خـۆت لـە ئەلوسـکاش تـوورە دەکـەیت، سـەرەرای هـەموو شـتێك کیـژی ئـەوی. بۆچـی مـن لـە گـەڵ خـۆم بیهێـنم، هەڵدەستیتەوە و دەتەوێ لە پەنجەرەکەوە فرێی بدیتە دەرەوە.

ئەنکلەنکا، وا بکە، کیژەکەم فرێ بـدە، لـە پەنجەرەکـەوە فرێـی بـدە، دەسـتەکانت ئەلەرزێت، رەنگە کیژەکە بکەوێتـە ژێـر چـەرخی شـەمەندەفەرە بـە تەوژمەکـە و ورد بێـت، ئەگـەر لـەم گەردوونـەدا خودایـەك هـەبێ، فریـشتەیەك هـەبێ، دەسـتی

نهێنی بۆ رادەکێشێ وا دەکات هیچ ئازار نەبینێ. رەنگە ئەلوسکای خۆشەویست بە نەرمی بکەوێتە سەر ئەرزەکە و لە دووری سکەی شەمەندەفەرەکە خەوی لێبکەوێت، رەنگە بۆ بەیانیەکەی مەسیحیەکی ئازدار بەزەیی بە ئاکارە فریشتەیەکەی بێتەوە و لە سەر ئەرزەکە بەرزی بکاتەوە و بە سینگی وەبنێ و لە گەل خۆیدا بیباتەوە ماڵی خۆی و وەك كیژی خۆی پەروەردەی بکات.
وابکە ئەنکاو وابکە، یەك جرکە دوو دڵ مەبە!

## جیابوونەوە

لە 12 یولیۆ/تەمموزی1942 هیرتا جوسیاس لە هامبۆرگ نامەیەکی بۆ کیژە تەمەن هەڤدە ساڵیەکەی هانیلی نوسیبوو کە لە گەڵ خوشکی ئەنجلین بۆ ملێرودی سوید رۆیشتبوون دەیزانی کەوا ئاوارە دەکرێ بەڵام نەیدەزانی بۆ کێندەرێیە، وای نوسیبوو: (( خۆشەویستەکەم هانیلی، داوا دەکەم، تکایە ئاگاداری ئەنجلینی خوشکت بە لەو رۆژەوە ببنە دایك‌وباوکی، لە گەڵی نیان بە و بەڵێنم پێ بدە ئاگاداری دەبی، یەکتری بگرن و بەردەوام چاودێری بکە، بڕوام بە تۆ بێ سنوورە، کیژی گەورەم لە مێژە ئاگامان لە هەواڵی یەکتری نیە، هەرکە بوار هەبوو بۆت دەنووسم )). نامەکەی بەوە کۆتایی پێ دەهێنێ کە خودا چاودێرییان بکات و لە بیریان نەکات. ئەم جۆرە نامانە سێدارەیان لە سەر بوو و ئەوانەی دەیانزانی دەمرن دەیاننوسی.
زۆر نامەی وا کە پارێزراون، نامەکان رەنگدانەوە و نموونەیی ئەو خێزانە جولەکە و قەرەجانەیە کە لە ژێر چەپۆکی نازییەتدا دەژیان، منداڵیان لە دایك‌وباوکیان و دایك‌وباوکیان لە منداڵ جیا دەکردەوە. ئەوانەی بەم کارانە هەڵدەستان خۆشیان باوك بوون و منداڵیان هەبوو، بەڵام دیار بوو ئەوەش کاری لێنەدەکردن، ئەو دکتۆرانەی لە ئوشفتیز رۆژانە کاریان دەکرد. ئێواران دەگەڕانەوە، یان ژن و منداڵەکانیان لە نزیك ئوردوگاکەدا دەژیان. رەنگە چەند هەزار منداڵیان ، دایکیان بەرەو رووی مردن کردبێتەوە، چۆن دەیانتوانی هەموو مانگێ وا بکەن کەچی بەرامبەر منداڵەکانیان باوکی روو خۆش و مێردی باش بوون بەرامبەر ژنەکانیان ،پرسیارێکیان ئاراستەی ئەندازیاری ئەڵمانی هیرمان فریدریك گرییە کردووە، چی

هانىدا چەند پیاوی جولەكە لە كاتی شەڕدا رزگار بكات، لە وەڵامدا وتی، ناتوانم روونی بكەمەوە ، بۆ و چۆن ، بەڵام ئەوەی دەزانی كە دایكی ژنێكی بەرەچەڵەك رێزدار بوو، بۆ ئەو ئەوەیان زۆری دەگەیاند، رۆژانی منداڵی ئەو لە گەڵ چەند هاورێی تەمەنگیان بە پیرە ژنێكی كەمئەقڵە هەڵچنیبوو، هەروەها گریبە وتی: (( دایكم وتی چۆن ئەوەت كردووە، نابێ جارێكیتر كاری وا بكەیت )) بێگومان وەڵامم دایەوە: (( هەموو وایان كرد )) ، دوایی ئەو بە توندی وەڵامی دامەوە، تۆ وەك كەسانیتر نیت، تۆ كوڕی منی ، نابێ جارێكیتر كاری وا بكەیت، ئەگەر ئەمەیان دووبارە بێتەوە، لێپرسینەوەت لە گەڵ دەكەم، ئەو جا دەزانی لێپرسینەوەكەم چۆنە، دەتەوێت تۆ لە جێگای ئەو بیت، وەڵامم دایەوە، نا. وتی: (( ئەدی بۆ وات كرد؟ دەبێ جارێكیتر ئەم شتە نەكەیت، ئەو ژنەش هەستی هەیە، دڵی هەیە وەك منە و وەك تۆ )). كارێگەری دایكم وا بوو لە سەرم كە بە منی وت: (( بڕیار لە سەر خەڵك لە بەر رۆشنایی نابین و كاریان مەدە، بەڵكو وەك ئادەمیزاد سەیریان بكە )). رەنگە وەڵامەكەی بۆ پەروەردەیی فسەیەكی زۆر گەورە بوو كرا بەڵام مەسەلەكە گرنگە و هەڵەكەش لەوەدایە كە بە جیدی لێكنەدرێتەوە.

## ماڵئاوایی

شەمەندەفەرەكان یەك لە دوایی یەكدا ئاوارەكراوەكانیان دووردەخستەوە، تیریس موللر پاش رزگار بوونی لە ئوشفتیز دەگێڕێتەوە (( تیشكی رووناكی لە پەنجەرە بچوكە ئاسنبەندەكە بۆمان دەهاتە ژوورێ و سروشتە شاخاوییەكە بە خێرایی لێمان گوزەری دەكرد. دارەكان چییان دەوێ بگێڕنەوە؟ دەنگی زیكەی سكەكانی ئاسن و شەمەندەفەرەكان بۆ سكەیەكی دەسورانەوە؟ ئێستا كەسەكان جیا ناكەمەوە، هەموویان وەك هاورێ دەبینم. هەموو چاوەڕێین . یان خەوتوون، بێدەنگی خۆی سەپاندبوو، ئەو خەڵكە خێزانی من بوون، هەستمان بە هاوكاری دەكرد، هاوكات دەمزانی ئەوە ماڵئاواییە، دڵنیام كەوا زۆرمان لە ناو دەچین، كۆشش دەكەین سەیری شتەكان وەك خۆی بكەین، ئێستا شەفەقە، دایكم دەستی دەكوشیم، ئەوەیان ماڵئاواییەكەی بوو.

(( بە پێنوسی ڕەش لە ناو فارگۆنی کەلوپەلێکی شەمیَ کراو نوسرابوو )).
من لە ناو ئەو فارگۆنەدا، ئیڤا
لە گەڵ کورەکەم هابیل
هەر کەسێ کورە ئۆبەرەکەمی، قابیل بینی
قابیل کوری ئادەم
ئاگاداری بکاتەوە کە من
دان باجیس (( وەرگێرانی . ئیڤا نوکرباری ))

ئەوان بە تەمابوون خراپتر روو بدات
ئەوان بە تەمای شتی ناشیاو نەبوون (( شارلوت دلبو ))

## ئاوارە کردن بە پاپۆری ئەس ئەس دوناو

بەیانی زوو رۆژی 26ی نۆڤەمبر/ تشرینی دووەمی 1942دا 532 جولەکەی نەرویجی خرانە سەر پشتی پاپۆری ئەڵمانی ئەس ئەس دوناو و لە هەمان رۆژەدا پاپۆرەکە ئاوی بەندەری ئوسلۆی جێهێشت، جولەکەکان لە 1/دیسمبر/کانوونی یەکەم گەیشتنە ئوردوگای گرتنی ئوشفیتز ، یەکسەر پیر و نەخۆش و ژن و منداڵەکانیان بە گاز کوژران کە بە بونکر 2ی ناسرابوو لە بیرکناو، بەڵام پیاوەکان خرایە ژێر باری ئیشی بەزۆر، ئەڵمانیا و هاوپەیمانە نەرویجیەکانیان کۆڵیان نەدەدا لە دوایی گەران بە دوای جولەکەدا. هەتا ساڵی 1944 ژمارەی ئەو جولەکانەی بۆ ئوشفیتز دوور خرانەوە گەیشتە 770 کەس. بێجگە لە 24 کەسیان ئەوانی تر هەموویان مردن و رزگار بووەکان هەتا شەڕەکە تەواو بوو مابوون و خۆیان گەرانەوە.

## که له هەموو شتێ رووت بکرێتەوە

هیرمان ساشنوڤیتز ئەوەی لە پرۆسەی فڕکردنی دوورخستنەوە ترسناکەکەی نوسلۆ رزگاری ببوو وا دەگێڕێتەوە (( نیومرۆ گەیشتینە نوسلۆ، ئاسمان ڤاودییەکی دڵتەنگ بوو، هۆرنەکان بە ناگاهێنانەوە لە بوونی دزە فڕین لێدەدرا، هیچ نەرویجیەکی مەدەنی شاهیدی نادات، گەرچی خەڵکێکی زۆر لە پێش بەربەستەکەی شۆستەی ئەمریکا وەستا بوون، هاوڕێیە نەرویجیەکان لە پەنجەرەی فارگۆنی نەخۆشەکان دیار بوون. زۆرترم بینی، میتالی رەشی ڤاوەیی پاپۆرەکەم لە دوور حەوت، هەشت مەتری بینی، ئەویش (( ئەس ئەس دوناو ئاوسی بریمن )) بوو ، پاپۆری دیلەکان ، دەنگی پیاوێکی نیگەران لە دەرەوەی فارگۆنەکە دەهات سەبارەت بە ژن و منداڵەکان شتێکی دەووت، خەمی ئەوەمان بوو ژنەکانیش گیرابن، پرۆفیسیور ئەبستاین دایە پرمەی گریان ، هەموومان چۆکمان شکا، هەتا منیش.

دوایی هێزەکانی پاسەوانی نەرویجی کە هاوڕێمان بوون بزر بوون، لە جیاتی ئەوان سەربازانی ئەس ئەسی ڤاتی سەوز لە بەر هاتن، ناوچەکە پڕبوو لەوان، لە گەڵ هەرەشەی شێتانەی ئەفسەرەکانیان بۆ سەر پشتی پاپۆرەکانیان سەر خستین، ئێمەی نەخۆش دوا مێگەل بووین هەمووشتمان بینی، ژن و منداڵ و پیاوەکانی بێ هەواو خەباتیان دژ بە دەستەڵاتی درندانەی پووچ بڕوەچان دەکرد، بازنەیەکی پۆڵاین لە چواردەووری ئەو لانەوازانە گیرابوون. ئەم دیمەنانە لە ترسناکترین وێنە دەچوو، ئێمە هاوڵاتی وڵاتێك بووین کە هاوکاری مرۆڤایەتی یەکەمین و گەورەترین هەڵوێستی بووە، ئەم رووداوە کوشندەیە زۆر گەورە بوو و بڕواشمان وابوو کەوا لەوە دژوارتر نابێتەوە.

زیاتر لە شەش سەد کەس بە ئاشتی و ئاسوودەیی لە وڵاتێکی یەکسا دەژیایین. لە ناکاو هەمووشتمان لێ وەردەگیرێتەوە، ئازادییەکانیان ، وڵاتەکەیان لە هەموویان ناخۆشتر بەهایە مرۆڤایەتیەکان. پاڵیان دەدان، لێیان دەدان ، تێیان هەڵدەدان، نوشتانەوە، پارانەوە تا سواری پاپۆرەکەیان نەکەن، چونکە دەیانزانی ئەوە چی دەگەێنێ، دوورخستنەوە، بە شۆستەی بەندەرەکە وەنووسان، هەستیان چڕکرد، هاواریان کرد و داوای دڵۆڤانیان بۆ خۆیان کرد و بۆ ئەوانەی پەیوەندییان پێوە

هەیە، بەڵام هیچیان لێقبول نەکرا. بە پۆستاڵی نووك ئاسنین و قامچی پلاستیکی بە سەروسکیان کەوتن. لە ژنانیان دا منالی شیرەخۆرەیان لە باوەش دەبوو، لە ژنی ئاوسیان دا، جل‌وبەرگیان لە بەر هەڵزراندن و رووتیان کردنەوە، منالانیان تێهەڵدایە ئەم لاو ئەو لا . لە ئاوەندی ئەوانەوە . ئێستاش لە پێش چاوم ماوە . دەمبینی رێچکەی ژنانی لاواز و پیری داوەشاوەی سەر شۆر بەسەر پردە بە گوریسەکاندا بەرەو پارۆزەکە دا دەرۆیشت. بەرەو ئەو ئاسۆیان دەبردن کە دوا چارەنووسیان بوون گەرچی ئەوان لە ئێمەی گەنج زۆرتریان دەزانی، مێژووی میللەتەکەیان دەزانی، زیندووی زوو کوژراو بوون )).





## ڕێگای شەمەندەفەرە تایبەتیەکان

تۆری هێڵەکانی ئاسنی ئەوروپی دەوری دیاری هەبوو لە جێبەجێ کردنی قۆناغەکانی قڕکردن. ملیونەها کەسیان بە شەمەندەفەرە تایبەتیەکان گواستەوە. قوربانیەکەنیان بە فارگۆنەکان گواستنەوە یان فارگۆنەکانی ڕێبواران بۆ گیتوکان و شوێنەکانی لە سێدارەدان و ئوردوگاکانی کۆکردنەوە و ئوردوگاکانی قڕکردن لە نێوان ئەوروپادا گەیاندن، قڕکردن بۆ نازییەکان زۆر بایەخدار بوو و کاریگەری خراپیشی هەبوو لە گەیاندنی پێویستیە سەربازییەکان ئەوەش لەبەر سەرقاڵییان بە گەیاندن و گواستنەوەی جولەکەبوو.

هێزەکانی ئەس ئەس شەمەندەفەریان دەگرت و پارەی بلیتیان بە جولەکەکان دەدا تاجولوکوکان چوون و گەیشتنیان بۆ ئوردوگاکانی قڕکردن پارەشی تێدەچوو.

لەم نەخشەیەدا هێڵەکانی شەمەندەفەر لە ناو پۆلونیا دیارە کەوا جولەکەیان بۆ تربلینکا گواستیتەوە. وا لە خوارەوە برگەیەك لە وێنەی کاتی دەرچوونی شەمەندەفەرە تایبەتیەکانیانە، وەك دیارە شەمەندەفەرەکە لە سزیدلوفیك لە ڕۆژی 25 سپتمبر/ئەیلول 1942 بە باری تەواوە ( 800 تۆن ) دەرچووە و ڕۆژی دوایی کاتژمێر 11:24 شەمەندەفەرە بەتاڵەکە ( 600 تۆن ) دەگەڕێتەوە بۆ کوزلبنتشە کە پاش نیوەی شەو دەگاتێ و بە باری تەواوە وە دەچێتەوە تربلینکاو بە بە تاڵی دەگەڕێتەوە. ڕۆژ دوای ڕۆژ ، مانگ دوای مانگ ، لە مێژووی یولیو/تەمموز 1942 هەتا ئوگست/ ئابی 1943.

1943 8/ینایر/کانوونی دووەم

یەکەم تەقینەوەی سەرهەڵدانی گیتوی وارشۆ.

2/فبرایر/شوبات

سەرکەوتنی هێزەکانی سۆڤیەت لە ستالینگراد بە سەر سوپای ئەڵمانی.

22/ فبرایر/شوبات

لەسێدارەدانی سۆفیا شۆل، یەکێك بوو لە ئەندامانی (( گوڵی سپی )) . کۆمەڵەیەك بوو

لە کۆمەڵانەی بەرگری لە خوێندکارانی زانکۆی میونیخ پێکهاتبوو و نارازی بوون لە دادگاکانی نازیەت.

26/فیرایر/شوبات

گەیشتنی یەکەم کاروانی قەرەجەکان بۆ ئوشفیتز لە ئەڵمانیەوە و لە ئوردوگای تایبەت بە قەرەجەکانیان دادەنێن.

22/مارس/ ئادار . 25 یونیو/ حوزیران

چوار فرنەکە لە ئوشفیتز . بیرکناو کە لە چوار ژووری گاز پێکهاتبوو تەواو بوو و ئامادەکران بۆ کار کردن.

30 19 ئەبریل/نیسان

دیداری نوێنەرانی ئەمریکا و بریتانیا لە برمودا کرا بۆ گفتوگۆی رزگار کردنی جولەکەی ئەوروپا.

19/ ئەبریل/نیسان

سەرهەڵدانی گیتو لە وارشۆ.

16/مایو/ئەیار

دامرکاندنی سەرهەڵدانی وارشۆ و رووخاندنی گیتوکە.

8/یونیو/حوزیران

3000 منداڵ و دایکیان لە هۆڵەنداوە بەرەو ئوردوگای سوبیبور بەری کران و بە گەیشتنیان بە گاز کوژران.

11/یولیو/تەمموز

هتلەر بەکارهێنانی بە ئاشکرای (( چارەسەری بنەرەتی کێشەی جولەکەی)) قەدەغە کرد.

12 ئوکتۆبەر/تشرینی یەکەم

دانیمارکیەکان دەست پێشخەریەکیان کرد بۆ رزگار کردنی جولەکەی دانیمارکی.

1944 19/مارس/ئادار

ئەڵمانیا هەنگاریا دەگرێت و دەست دەکات بە کۆچکردنی جولەکەی هەنگاری.

6/یونیو/تەمموز

رۆژی دی هاوپەیمانەکان هێزەکانیان لە نورماندی دابەزاند.

20/یولیو/تەمموز

چەند ئەفسەرێکی ئەڵمانی ویستیان هتلر بکوژن.

یولیو/تەمموز

رزگار کردنی ئوردوگای فڕکردنی مایدانیك بە دەستی سوپای سوور.

12/ئوگست/ئاب

لە سێدارەدانی خێزانە قەرەجەکان لە ئوردوگای ئوشفیتز.

نۆڤمبر/تشرینی دووەم

کوشتنی بە گازی زیکلون - بی لە ژوورەکانی گاز لە ئوردوگای ئوشفیتز راوەستێنرا.

1945 18 - 17/ینایر/کانوونی دووەم

هێزەکانی ئەس ئەس دەستیان بە چۆڵکردنی بە زۆری ئوردوگای ئوشفیتز کرا.گیراوەکانیان ناچار کرد بە پیادەیی بەرەو ئەڵمانیا برۆن و ناویان نا کاروانی مردن.

27/ ینایر/کانوونی دووەم

سوپای سوور ئوشفیتزییان ئازاد کرد.

11/ی ئەبریل/نیسان

هێزەکانی ئەمریکایی ئوردوگای گرتنی بوخنفالدیان ئازاد کرد.

15/ ئەبریل/نیسان

هێزەکانی بریتانی ئوردوگای گرتنی بیرگن بیلسن یان رزگار کرد.

30 29 ئەبریل/نیسان

هێزەکانی سۆڤیەتی ئوردوگای گرتنی رافنسبروکیان ئازاد کرد و نزیکەی 3500 ژنی گیراوی جولەکەی تێدابوو.

30/ ئەبریل/نیسان

هتلر خۆی کوشت.

8 ـ 7 مایو/ئەیار

ئەڵمانیەکان خۆیان دا بە دەستەوە، ڕۆژی سەرکەوتن، کۆتایی هاتنی شەڕ لە ئەوروپا.

(( بەم شێوەیە، زۆربەی گیراوە جولەکەکان، ژن و پیاو، منداڵ و پیرەکان بە فارگۆنی مەڕوماڵات ڕەوانەی ئەڵمانیا دەکران و لەوێشەوە ڕەوانەی پۆلونیا کران)) (...). ( لە بودابست ) پراکتیکانە جولەکەیان لە هەموو شتەوە رووتکردەوە، دەبوایە بە ڕێژەی 9ـ 8 کەس لە یەك ژووردا بژیین (....) بەڵام ئەوانە بەختەوەرەکان بوون و لە کاتی پێویستدا بۆ کاری گرنگ نیشیان پێدەکردن، بۆ دامەزراوە پیشەسازییە ئەڵمانیەکانیان گواستنەوە. لەوێ دەگونجا ڕەفتاری جاکیان لە گەڵ کردبان، بە پێچەوانەی ئەوانیتر ، منداڵان، ژن، بێدەستەڵاتان، پیرەکان دەڵێن (( ئەوانە دەگوازرێنەوە بۆ ئوردوگاکانی فڕکردن لە ئوشفیتز ـ بیرکناو لە نزیك کاتوفیتز لە پۆلوینا )).

ڤیڤان دانیلسون، دبلوماسێکی سویدی لە بودابست

لە ڕاپۆرتێك بۆ وەزارەتی دەرەوە لە ستۆکهۆڵم 24 یونیو/حوزەیران 1944

ـ ڤیدمان، ئامۆژگەی تەکنۆلۆژی تاوان دەتوانێ بەشێکی زۆری ژەهرمان بۆ دروست بکات؟

+ بۆ چ مەبەستێك؟ ئایا بۆ کوشتنی ئادەمیزاد بێ؟

ـ نەخێر

ـ بۆ کوشتنی ئاژەڵ؟!

ـ نەخێر

ـ ئەدی بۆ چ مەبەستێك؟

ـ بۆ کوشتنی ئەو ئاژەڵانەی ئاکاری مرۆڤیان هەیە، یان بە مانایەکی تر، ئەوانەی نەخۆشی مێشك و دەروونیان هەیە. ئەوانەی کەوا ناکرێ پێیان بڵێین ئادەمیزاد و ئەوانەی ناتوانرێت مەزندە بکرێت تەندروستیان باش دەبێت.

دانوستانێك لە نێوان دکتور ئەلبەرت ڤیدمان، سەرۆکی بەشی کیمیاوی لە ئامۆژگەی تەکنۆلۆژیای تاوان لە گەڵ یەکێك لە فەرمانبەرانی بارەگای

ئودولف هتلر ، یولیو/تەمموز/ 1938

## دەستپێكردنی كۆمەڵ كوژیەكە

كوشتنی بە بەرنامەی جولەكە و قەرەجەكان پاش كوشتنی كەم ئەندام و شێت و (( ناكۆمەڵایەتیەكان )) هات كە بە رەزامەندی و پەسەندكردنی حكومەت ئەنجام دەدرا. پرۆسەكە لە 1ی ئوكتۆبەر/تشرینیەكەم/1939 لە ژێر ناوی تی4 و بە سەرپەرشتی بارەگای ئودولف هتلر دەستی پێكرد. قوربانیەكان لە سەرانسەری ئەڵمانیادا لە عیادەكان كۆكرایەوە، خرانە ناو پاسی قاوەیی، پەنجەرە و پەردەكانیان داخراو و رەنگ كراو بۆ عیادە تایبەتیەكان، ناو لەو عیادانە نرا (( مردنی دلۆڤان )) كە ژووری گاز و ئامێری سوتانی تێدا بوو. دكتۆرەكان بڕیاریان دەدا كەوا كێ ئەوانەی (( پاك دەكرێنەوە ))، واتە لە ناو بردنیان. خزم و كەسیان بە نامەی وەكو یەك ئاگادار دەكردەوە (( ناچارین ئاگادارتان بكەینەوە كەوا بە داخەوە.......لە ......بە هۆی تووش بوونی بە نەخۆشی ئەنفلونزا مرد و دكتۆرەكان كۆششی زۆریان بۆ رزگار بوونی كرد)). زۆریش چەند ئەندامی لاشەی (( كوژراوی دلۆڤان )) یان دەگێرایەوە و رەوانەی ئامۆژگاكانی تەندروستیان دەكردن بۆ بەكارهێنانیان بۆ مەبەستی خوێندن. لە نێوان 1945ـ 1940دا (( 120 )) هەزار كرانە قوربانی مردنی دلۆڤان.

پرۆسەی تی4 هێندی هێندی لە ئابی 1941 راگیرا، ئەوەش لە بەر نیگەرانی رای گشتی بوو كە ببووە سەرچاوەی بێزاری لە نوسینگەی سەركردەیی گشتی (( فوهرر )).

هاودەم كۆمەڵ كوژی جولەكە لە وڵاتانی بەڵتیك و بەش داگیركراوەكانی یەكێتی سۆڤیەت كارێكی رۆتینی بوو، لە نێوان 30ـ 29/سپتمبر/ئەیلول/1941 گەورەترین كاری بێ وێنە رووی‌دا، كۆمەڵێك لە دەستەی (( ئینساتز )) بە هاوكاری پۆلیس 33371 جولەكەی ژن و پیاو و منداڵیان لە بابی یاری دەرەوەی كییف گوللە باران كرد.

هێزێكی ئەس ئەس لە ژێر فەرماندەیی (( ئەندازیاری )) كۆمەڵكوژی هاینش همار بەرپرسی جێبەجێ كردنی كۆمەڵكوژییەكان بوون. لە ئوكتۆبەر/ تشرینی

یەکەمی 1943دا سەبارەت بە (( فڕکردنی گەلی جولەکە )) هەلر دوانیدا و ستایشی دلسۆزی بەرزی ڕێکخراوەکە و ئەندامەکانی بۆ جێبەجێ کردنی کارەکەیان کرد و وتی: (( ئێمە مافی ئەخلاقیمان هەیە، مافی خۆمانە ئەو گەلە بکوژین کە دەیانەوێ گەلەکەمان بکوژن......ئەم ئەرکە زۆر قورسەمان لە بەر خۆشەویستی گەلەکەمان ئەنجامی دەدەیین، ئەوەش هیچ زیانی ناوەوەی بۆ جێنەهێشتین، چ لە دەروونمان و چ لە چاکەکانمان )). بکوژەکان بە بوونی تەنگژەی زۆریشەوە هەر (( ڕاستیەکانیان )) دەپاراست.
یەکێك لە ئەفسانەکانی پاش شەڕ ئەوە بوو، کەوا هەر کەسێ سەرپێچی بڕیاری فڕکردن یان بەشداریکردن لە کۆمەڵکوژی ئوردوگاکان بکات سزاکەی مردنە. گەرچی حاڵەتی وا ڕووی نەدابوو. کەم کەس هەبوون داوای گواستنەوە یان بەخشینیان لەم کارە دەکرد، بەڵام لە لای زۆرینەکە بیری وا نەبوو، جولەکە وەك (( زیندەوەر )) تەماشا دەکران، هەرکەسێ کە کاری دەکرد بە کاری پیرۆزی دەزانی لە پێناوی فوهرر و خاکی باپیرانی. گەر ئیشەکان بە دزیش کرابان ئەوا دەستکەوت و سەرمایەی چاکیان لە قوربانیەکان دەست دەکەوت.
پاسەکان لە هەفتەیەکدا چەند جار دەهاتنە هادامار و چەندین قوربانیان هەلگرتبوو، منالانی خوێندنگاکانی ناوچەکە پاسەکانیان دەناسی و دەیانووت: پاسەکانی کوشتن هاتن ، دانیشتوانی هادامار کە هەموو جارێ ئەو پاسانە دەهاتن دووکەڵی بەرزیان لە کونی دووکەڵەوە دەبینی، ئەوان نیگەران دەبوون چونکە بەردەوام بیریان لەو قوربانیەیە بەستەزمانانە دەکردەوە. بە تایبەتی کە با هەڵی دەکرد و بۆنەکەی گیانی دەشێواند، دەرئەنجامی ئەو هەڵوێستانە بوو کە توانجی وای لە نێو منالەکان دروست دەکرد کە دەبووە شەڕیان دەیانووت: ئەی دەبەنگی گێل لە فرنەکەی هادامارا دادەنرێیت.

**نامەی مەشرانی کاسۆلیك لە لیمبورگ بۆ وەزیری داد لە 13/ئوگست/ئابی 1941**

## له بەلتیکدا

ئەم نەخشەیە بە راپۆرتی دەستەکانی ئیساتزاوە وەبوو، مەلبەندی چالاکیە سەرەکییەکانی ولآتانی بەلتیك بوو، لە نەخشەکەدا دیارە کە چەند (( لە سێدارەدان بۆ جولەکە کراوە )). ژمارەیان بە دارەمەیت و ژمارە دیارە، لە ئەستونیا کەوا (( جولەکەی تێدانیە )) نوسراوە کەوا 128 هەزار جولەکەی لێدەژیت. دەستەی ئینساتز پارمەتی و کۆمەکیان لە هێزەکانی ئەلمانی و میلشیا هاوپەیمانەکانیان لە بەلتیك و روسیای سپی و ئوکرانیا وەردەگرت. ئەفرام توری کە لە گیتوی کاونـاس لە لیتوانیـادا ژیاوە و لـە دەفتـەری یادگارەکانیـدا لـە رۆژی ناردنی دانیشتوانی گیتو بۆ پرۆسەکانی (( دەست نیشانکردن )) کە تێیدا بریاری لێدەدرێت کێ دەژی و کێ نـاژی نوسیویەتی: (( بەیانی رۆژی سێشەممە 28 ئوکتۆبەر/تشرینی یەکەم باران بوو، تەمومژ و تاریکی باوەشی لە گیتو وەرنابوو، ئاسمان نەدەبینرا و بەفر باری و ئەرزەکەی سپی کرد. لە هەموو سوچێکدا ژن و پیاو و منالّ و پیر و نەخۆش دەردەپەرییەن، هێندی هێدی دەهاتن ، هەنگاو قورس و بێزار دەرۆیشتن، پیرو نەخۆشەکان بە شان و پیل و بەژنی خزم و کەس و جیرانەکانیان رێیان دەکرد. دایکان منالّەکانیان هەلگرتبوو، بەرێزەی درێز بەرەو پێشەوە دەچوون. هەموویان لە ترسی سەرما و شێ خۆیان لە پالتۆ و چارۆگەو پەتۆ لوول دابوو. زۆر لە خێزانەکان دەستی یەکتریان گرتبوو و هێدی دەرۆیشتن. هەموو بەرەو پێشەوە بۆ گۆرەپانی - دیموکراسی - بە یەك ئاست دەچوون، کاروانێکی تازەیە بار و مردووەکان سەرەخۆشیان لێدەکردن. ئەم بەیانیە بەرەو گۆشەی نادیار 30 هەزار کەس بەرێ کران، بەرەو ئەو چارەنووسە دەرۆیشتن کەوا زووتر دەستەلآتدارە تێنووەکەی خوێن بریاری لە سەر دابوو. بێدەنگیەکە بێدەنگی مردووی دەنواند کە لە سەر ئەو کاروانە هەزار کەسکیە، هەموو هێدی هێدی دەجولآن، خەیالّ دوور، هەموویان بیریان لە چارەنووسی خۆیان و خێزانەکانیان دەکردەوە، هەموویان ژیانیان بەداوێك لە ئاه گرێ درابوو، سێ هەزار کەسی بێکەس، خودا و جیهان لە بیری کردبوون، درانە دەست دەستەلآتی غەدر و ئەوانەی زووتر تاوانی کوشتنی جولەکەیان لە ئەستۆدایە )).

## دەستەکانی ئینساتز

داگیرکردنی یەکێتی سوڤیەت لە یونیو/حوزیرانی 1941، پرۆسەی بارباروسا، پێشینەی کوشتنی بە بەرنامەی جولەکە بوو، لە گەڵ سوپای ئەڵمانی چوار دەستەی گەرۆکی ناسراو بە دەستەکانی ئینساتزیان لە گەڵ بوو. پیاوەکانیان پۆلیس و هێزەکانی ئاسایش و هێزەکانی ئەس ئەس بوون، ژمارەیان لە سەرەتادا سێ هەزار کەس بوو ئیشیان ئەوە بوو لە پشتەوە هێڵەکانی پارێزگاری سوپایان دەکرد و شیوعیە چالاکەکان و (( ئەندامەکانی حیزبەکە )) لە جولەکەیان دەکوشت، هەر زوو کاری سەرەکییان بووە کوشتنی جولەکە و دوایی قەرەج و کۆکردنەوەیان بۆ کوشتنیان. ئەم دەستانە کاری ورد و بە بەرنامەیان ئەنجام دەدا و راپۆرتی بەردەوامیان دەنارده برلین و دەکرێ لە بەر رۆشنایی ئەم راپۆرتانە بەدواچونەوەی پرۆسەکانی رۆژانەی کوشتنی جولەکە بکرێت.

یەکێك لەو بەڵگەنامانە لیستەیەکی حەوت لاپەرەیی تێدایە کە تۆماری ناوی هەموو ئەوانەی لە لیتوانیا لە نێوان 4یولیو/تەمموز تا 1دیسمبر/کانوونی یەکەم 1941 لە سێدارە دراون. کە لە لایەن یەکێك لەو دەستانە ئەنجام دراوە و ژمارەی هەموویان دەگاتە 137346 کەس لە شوعیە روسەکان و لیتوانیەکان ، گیراوەکانی روسی شەڕ ، (( ئەوانەی نەخۆشی دەروونیان هەیە ))، لیتوانیەکان و پۆلونیەکان و قەرەج و پێشمەرگە، بە بێ بەراورد کردن زۆربەیان جولەکە بوون لە پیاوەکان و ژن و منالەکانین. بە پێی ئەو برگەیەی کە لە رۆژانەکەی ئەفرام توری دەردەکەوێت کە پێناسەی جولەکە لە کاوناس لە بەیانی رۆژی 28 ئوکتۆبەر/ تشرینی یەکەم 1941 دەکات کە بە رێگاوەن بۆ پرۆسەی (( دەستنیشانکردن ))ی گەورە. ناواخنی لیستەکە وایە: (( 41/10/29 کاونـاس ......2007 جولەکە، 2920 ژنە جولەکە، 4273 منالە جولەکە ( پاککردنەوەی گیتو لە جولەکە زیادەکان لە ژمارەیان ): 9200 کەس بوو )). دەستەکانی ئینساتز و تیمەکانی پۆلیس و یەکەکانیتر نزیکەی دوو ملیۆن کەسیان لە ئەورووپای خۆرهەڵات و یەکێتی سۆڤیەتی جاران کوشت.

کاری هەڵکۆڵین کاتی زۆری دەویێت، بەرامبەر ئەوەش لە سێدارەدانیش زۆر خێرا ئەنجام دەدرا (( سەد کەس لە هەر چل دەقیقەیەکدا ))..... سەرەتا کاریگەری لە سەر سەربازەکان نەبوو، بەڵام بۆرۆژانی دوایی هەندێکیان هێزی دەروونیان نەما بوو بۆ بەردەوامکردنی جێبەجێ کردنی لە سێدارەدانەکان. بۆچوونی تایبەتی وایە مرۆڤ لە کاتی ئەنجامدانی لە سێدارەدانی مرۆڤ تووشی تەنگژەی دەروونی نایێت، بەڵام چەند رۆژێك لە مرۆڤ دەردەکەوێ پاش ئەوەی ئێواران دەگەوێتە بواری هێمنی و بێدەنگی و پشودان.

(راپۆرتێك لە ئەفسەر والتر سەبارەت بە یەکێك لە پرۆسەکانی لە سێدارەدانی بلگراد ). 1 نوفمبر/تشرینی دووەم 1941))



لە سێدارەدانەکان سێ چوار سەعاتی دەویست، بەردەوام لە گەڵ بووم. تەنیا ئەو کاتە پشوم دەدا کە یەدەگان فیشەکیان تێدا نەدەما و دەبوایە داگیرێتەوە، بۆیە زەحمەتە بزانم و بڵێم لەو سێ چوار سەعاتە بە خۆم چەند جولەکەم کوشت. چونکە لەو کاتانەدا کەسانیتر لە جیاتی من گوللە بارانیان دەکردن، ئەو دەمانە عەرەقمان زۆر فڕدەکرد تا ئارەزووی کارمان بمێنێ.

ئەلفرید میتزنر، سەربازێکی ئەڵمانی.

## كۆمەلكوژییەكەی ژن و منالان

لە 14 ئوكتۆبەر/تشرینی یەكەمی 1942دا ژن و منالانی جولەكەیان لە گیتوی مسیوتشی لە ئوكرانیا راپێچی كەندێكی دەرەوەی روفنو كران و لەوێش بە ئاگری پۆلیسی ئەلمانی و میلیشاكانی ئوكرانی گوللەباران كران و كوژران، لەم وێنەیەی خوارەوە دیارە كە پۆلیسێك (( گوللەی دلۆڤانی )) لەو ژنانە دەدات كە هێشتا رووحیان لەبەر ماوە.



ئەم كارەش لە دوبنوی ئوكرانیا لە 5/نوكتۆبەر/تشرینی یەكەم 1942دا دووبارە كراوەتەوە هێرمان فریدریك پاش سوێند خواردنی لە دوای كۆتایی هاتنی شەرەكە وا باسی تاوانەكەی فیسبادن دەكات.

(( من و موتیك راستەوخۆ چووینە لای چالەكە، كەس رای نەگرتین ، ماوە ماوە گوێم لە پشت گردۆلكە خۆلەكە لە تەقە دەبوو، پیاوە قامچی لە دەستەكان لە چەند لۆریەك دابەزیین، فەرمانیان بە ژن و پیاو و منالانیتەمەن جیاواز داو بە پێی فەرمانی ئەس ئەس دەبوایە جلوبەرگیان داكەنن و جلوبەرگ و

کەلوپەلەکانیان بە ریز و رێک دابنێنن، پێلاو و جلوبەرگی ناوەوە و دەرەوە ریز بکەن گردۆلکەیەک پێلاوم بینی ، ژمارەیان 1000 ـ 800 جووت پێلاو دەبوو، جلوبەرگەکەش گردۆلکەیەکی گەورە بوو.

بە بێ گریان و هاوار جلوبەرگەکانیان لەبەر کردەوە، خێزانەکان کۆمەڵ کۆمەڵ بوون و یەکتریان ماچ دەکرد وماڵئاوایان بە یەکتری دەووت و چاوەڕێی هێمایەک بوون لە پۆلیسیە قامچی بە دەستەکەی سەر چاڵەکە، چارەگە سەعاتێک دەبوو لە تەنیشت چاڵەکە وەستا بوون گوێم بۆیان شل کردبوو. گوێم لە گلەیی و داوای دڵۆڤانیان نەبوو، خێزانێک سەرنجی راکێشام هەشت کەس بوون پیاو و ژنەکە پەنجا ساڵان بوون، منداڵەکان تەمەنیان لە یەک ساڵی و هەشت ساڵی و دە ساڵی بوو، دوو کیژی تەری عازەبیان لە گەڵ بوو تەمەنی بیست ساڵان و بیست و چوار ساڵان دەبوو. پیرە ژنێک منداڵێکی تەمەن یەک ساڵانەی دەلاوانەوە و لایلایەی بۆ دەووت و یاری لە گەڵ دەکرد و منداڵەکە لە خۆشیا دەنگی دەهات، دایکوباوکێک بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە تەماشای یەکتریان کرد و باوکەکە دەستی کورە تەمەن دوو ساڵییەکەی گرتبوو. لە سەر خۆ دەیدواند، کورەکە خۆی راگرتبوو نەدەگریا، باوکەکەش کورەکەی دادێنا، دیار بوو شتێکی بۆ روون دەکردەوە.

پیاوەکەی ئەس ئەس لە سەر چاڵەکەوە بانگی هاورێیەکەی کرد و بیست کەسی جیاکردەوە و فەرمانیدا بچنە پشت چاڵەکە و ئەو خێزانەی باسم کردن ئەوانی لە گەڵ بوو، چاک لە بیرمە کیژە پرچ رەشە باڵا بەرزەکە زۆر لە من نزیک رەتبوو و دەستی بۆ خۆی درێژ کرد و وتی (( بیست و سێ ساڵ )).

## لە دەستەکانی ئینساتز بۆ کارگەکانی مردن

بۆیان روون بۆوە کەوا کۆمەڵکوژی بە گوللە کاتی زۆری دەوێت و خراپ لە سەر نەفسیەتی هێزەکانیان دەکەوێتەوە و سەرنجی زۆریان راکێشراوە، لە پایزی 1941دا بیر لە پرۆسەیەکی کاریگەر بۆ کوشتنی ژمارەی زۆری خەڵک کرایەوە، پاش چەندین تاقیکردنەوە چارەسەری دۆزرایەوە، ئەویش گاز و بە هۆی بەرنامەی تی 4ی ساڵی 1941 تاقیکرایەوە، لە مەڵبەندەکانی ((کوشتنی

دلۆڤان )) گازی یەکەمی ئۆکسیدی کاربۆنی هەڵگیراو لە ناو لوولەی ئاسن بە کار هات، بەڵام ئەم بژارەش راست نەبوو بۆ کۆمەڵکوژی ئەو ژمارە زۆرەی لە بەرنامەیاندا بوو. لە جیاتی ئەوە پێشنیارکرا گازی مەکینەی سیارەکانی ئۆردوگای قڕکردنی شیلمنو بە کار بێنن، لە 17ی ئادار/مارسی 1942 ژوورەکانی گازی بلزك ئامادەکرا بوو بۆ وەرگرتنی یەکەم دەستەی جولەکەی گیتوی لیوبلین، لە ئۆردوگای بلزیك و سوبیبور و تربلینکا گازی دیزلی مەکینەی دبابەکانی رووسی گەورە بەکار هات، ئەوانەی لەم ئۆردوگایانە ئەم کارانەیان ئەنجام دەدا سەد کەس بوون کەوا پێشتریش پرۆسەی تی4یان ئەنجام دابوو.

لە پایزی 1941لە ئۆردوگای گرتنی ئوشفیتز گازی مادەی زیکلون بی قەلاچۆکردنی زیندەوەریان لە سەر تاقی کردنەوە. ئەم مادەیە بۆ قەلاچۆکردنی ئەسپێ لە جل‌وبەرگ و زنجەکان بە کار دەهات، دەرئەنجام دەرکەوت کەوا کاریگەری بە هێزی هەیە و گازی پەیدابووی سیانیدی هایدرۆجین خنکاندنی ناوەوە بە خێرایی دەکات. هەر زوو لە ئوشفیتز گازی زیکلون بی بۆ کۆمەڵکوژی بە کار هات، هەروەها لە ئۆردوگاکانی کۆمەڵکوژی مایدانك و هەندێ ئۆردوگاکانی گرتنی‌تر لە ئەڵمانیادا بە کار هات. بە ژمارەیەکی کەمی پیاوانی ئەس ئەس و هاوکارەکانیان نزیکەی سێ ملیون کەسیان لە ژوورەکانی گازی سەر بە ئۆردوگاکان کوشت کە لە دیسمبر/کانوونی یەکەمی 1941 تا نوڤمبر/ تشرینی دووەمی / 1944ی خایاند.

### مەترسی تەندروستی ڤارگۆنەکانی گاز لە سەر کارکەرەکانی

برگەیەك لەو راپۆرتەی ئەفسەری ئەس ئەس ئوجست بیکر کە پێشکەشی کردبوو وا باسی ئەو ڤارگۆنانەی گاز دەکات کە تایبەتبوون و لە ئوکرانیا و سربیا و ئۆردوگای قڕکردنی شلمنو بە کارهاتبوو.

سیارە تایبەتییەکانی گواستنەوەی ئینساتزدی و سی (( پشکنینی تەواو )) یان بۆ کرا. وا رێکخرا کەوا سیارەکانی دەستەی دی بکرێتە خانووی گەرۆك (( کەرڤانە )) ئەویش بە دانانی لە هەر لایەکی سیارە بچوکەکان و چەند پەنجەرە بۆ سیارە گەورەکان، وەك ئەو سیارانەی پیاو لە خانووەکانی گوندان

دەیانبینی، وای لێهات ئەم سیارانەی گواستنەوە دەناسرانەوە و بە دیتنیان پێیان دەووتن (( سیارەکانی مردن )) نەك هەر لە لایەن دەستەلاتدارەکانەوە بەڵکو خەڵکانی مەدەنیش وایان پێدەوتن. بە پێی بۆچوونی من چیتر ناتوانرێت ئەم سیارانە لەوە زۆرتر بە نهێنی راگیرێت و بشاردێتەوە سەرەرای هەموو دەستخەرۆکان و شاردنەوەیان.(....)

رێنماییم بۆ کارکەران دەرکرد کەوا لە کاتی کردنەوەی بۆرییەکانی گاز چەند دەتوانن خۆتان دوور راگرن لە سیارەکان نەوەك دزەکردنی گازەکان کار لە سەلامەتی تەندروستیتان بکات. ئەوە بە هەل دەزانم کەوا سەرنجتان بۆ چەند شتێ راکێشم:

هەندێ لە یەکەکان پاش پرۆسەکە چۆڵکردنەکانیان بە ئەندامەکانیان دەکرد، ئەوەش سەرنجی زۆر لە سەرکردەکانی یەکەکانی راکێشاوە کەوا ئەندامەکانیان تووشی ژانی نەفسی و جەستەیی زۆری کردووە، ئەگەر ئیمرۆ راستەوخۆ ئاشکرا نەبێ ئەوا لە دوارۆژدا لێیان دەردەکەوێت. هەندێ لە ئەندامەکان پاش هەر بە تاڵکردنێك هەست بە سەر ئێشە دەکەن، گۆرینی فەرمانەکان ئیمرۆ لە بەر مەترسییەکان بە باشی نازانم، وەك بە کارهێنانی گیراوەکان خۆیان بۆ بەتاڵکردنەکە بوار خۆش دەکات بۆ راکردنیان، داواکارم رێنمایی گونجاویان بۆ دەست نیشان بکەن تا ئەندامەکانمان لە مەترسی زیانەکان دوور بکەینەوە.

کوشتنەکانی بە گاز بە شێوەیەکی نادروست ئەنجام دەدرێت ، بۆ ئەوەی کارەکە بە خێرایی و زوو تەواو بکەین شوفێرەکان زۆر بە خێرایی پل بە پلاکی گازەکەوە دەنێن تا کارەکە زوو تەواو بێ، ئەوەش وا دەکات زیندانەکان بە خنکاندن دەمرن نەك بە سەر سوران وەك بەرنامەی بۆ دارێژراوە. وا دەردەکەوێ کە رێنمایەکان بە ناگرتنی پلاکەکان بە پێی ئەرەی پێویست کەسەکان خێرا دەمرن و گیراوەکان بە هێمنی دەخەون و دەم وچاوی شێواو و رەشانەوە و میز بەخۆداکردن و بەبێ ئاگایی رووی نادات وەك جاران کە رووی دەدا.

ئیمرۆ گەشتەکەم بەردەوام دەکەم بۆ دەستەی ئینساتز بی و لەوێ دەکرێت بۆ زانیاری زۆر پەیوەندییم پێوە بکەن.

بە درێـژایی زسـتانا بـە تـەواوی منداڵـەكان رووت بـوون، پێخـواس و بـە رووتـی ڕادەوەسـتان و چـاوەڕێیی نـۆرەی چـوونە نـاو ژووری گازیـان دەكـرد كـە لـە ژێـر تەوژمی زۆرا نیش دەكرا. بنی پێیان دەیبەست و بە شەختەكەی سەر ئەرزەكەوە دەنوسا، ڕادەوەسـتان و دەگریـان، هەنـدێكیان بـە ڕەقبوونـەوە مـردن، ئـەو كاتانـە ئەڵمانی و ئوكرانیەكان دەهاتن و دەچوون و لـە درێـژایی نۆرەكـەی چـاوەڕوانیان هەڵدەدا و ئازاری قوربانییەكانیان دەدا.

ئەڵمانیـەك نـاوی سیب بـوو سەرسەری و درنـدە بـوو تـامی لـە ئـازاردانی منـاڵان وەردەگـرت. كە دایكـەكان تـەنگاو دەبوون و لێی دەپارانـەوە لـە بـەر منداڵـەكان وا نەكات، ئەو منداڵێكی لـە باوەشـی دایكێـك دەردەهێنـا یـان دەیكردنـە دوو پارچـە و قاچی دەگرت و سەری بە دیوارەكە دادەدا و تەرمەكەشی دوور فڕێ دەدا.

یانكل فیرنك . یەكێك لە زیندووەكانی تربلینكا

## پرۆسەی راینهارد

لـە مـارس/ئـاداری 1942 هـەتا ئوكتۆبـەر/تـشرینی یەكـەمی/1943دا لـە ئوردوگاكـانی قڕكردنـی بلـزك و سوبیبور و تربلینكا نزیكـەی 1,7 ملیون كـەس كوژران.

ئـەم ئوردوگایانـە دەكەوتـە نـاو بەرنامـەی پرۆسـەی راینهـارد كـە مەبەسـتی قەلاچۆكردنی پۆلونیا بوو لە جولەكە و دزینی سـامانەكانیان، هیچ بە خـۆرایی نەدەرۆیشت، جل‌وبەرگ و پارە و هەگبەی تایبەتی و قژ و كیفكی زێری ددانیش، دوورخستنەوە و رزگار بوون لە تەرمی كوژراوەكان بە دەستی خـودی جولەكەكان ئەنجام دەدرا، ئوردوگاكان تەسك بوون. نزیكـەی 600م درێـژ و 400م پـان بـوو، ئەڵمانیەكان زۆر نەبوون لە هەر ئوردوگایەكدا هەر سی سەربازی هێزەكانی ئـەس ئـەس و سـەد بـەكرێگیراوی وڵاتـانی بـەلتیكی لێبـوو، ئوردوگاكـان هـەموویان لـە سـەرهەمان بنـچینە بـوون. بـە پێـی پێناسـەی ئەنـدامێكی ئـەس ئـەس كـە جـاران (( سـەرەتایی بـوو بـەڵام مەكینـەی مـردن بـەردەوام دەسـوڕا ))كـاری دكتـۆرەكـان نەبوو خەڵكی دەست نیشان بكەن وەك لە ئوشفیتز و مایدانك دەكرا. بە چەندین

شەمەندەفەر خەڵکی گەیشتێ، زۆربەی زۆری بە لۆری بوو، پێیان ڕاگەیاندبوون کەوا کار دەکەن بەڵام یەکەم جار دەبێ (( لە میکرۆبەکان پاکتان بکەینەوە )) بۆیە دەبێ هەمو جلوبەرگەکانتان داکەنن و شتەکان دابنێن، پیاوەکان و ژنانیش لە لایەك. دوایش بۆ ژوورەکانی گازیان دەبردن.

مەکینەکان کەوتنە کار و گازی یەکەم ئوکسیدی کاربۆنیان بە لوولەیەك بۆ ژوورە تەواو داپڕاوەکان تێکرد.پرۆسەکە هەمووی یەك دوو سەعاتی خایاند، لە یەك ڕۆژدا 15 هەزار کەسیان لە تربلینکا کوشت (( بەڵام کارمان هەتا نیوەی شەو بوو )) ئەوەش پیاوێکی ئەس ئەس جاران ڕوونی کردەوە. سەرەتا گۆڕی بە کۆمەڵیان بۆ ناشتنی تەرمەکان بە کار هێنا. لە ئوردوگای تربلینکا بە زۆری هەر سەد جولەکە ڕزگاریان بوو و لە سوبیبوریش هەر بیست سێیەك و لە بلزك دوو جولەکە بەس.

## تابلۆیەکی ڕێگا لە تربلینکا

جولەکەی وارشۆ!

ئێستا دەچنە ناو ئوردوگایەکی کاتی (( ترانزیت )) لەوێشەوە دەگوازرێنەوە ئوردوگایەکی کار کردن بۆ قەلاچۆکردنی پەتاکان دەبێ جلوبەرگ و کەلوپەلەکانتان بۆ پاککردنەوە دابنێنن، زێر و پارە و پارەی بێگانە بدەنە نوسینگەی دارایی بەرامبەر وەرگرتنی پسولەیەك، دەتوانی دوایی بە نیشاندانی پسولەکە وەریانبگریتەوە، هەموو ئەوانەی دەهاتن دەبوایە پێش بەرێکەوتنیان بۆ گەشتەکە خۆیان بە شوشتن پاك بکەنەوە.

ئوردوگای قڕکردن و ژمارەی قوربانیەکان

شلمنو

| | |
|---|---|
| دیسمبر/کانوون یەکەم 1941 | 152000 |
| یولیو/تەمموز/1944 | 320000 |

بلزك

| | |
|---|---|
| مارس/ئادار 1942 | 600000 |
| دیسمبر/تشرینی یەکەم 1942 | |

| | |
|---|---|
| سوبیبور | |
| ئەبریل/نیسان 1942 | 25000 |
| ئوکتۆبەر/تشرینی یەکەم 1943 | 700000 |
| تربلینکا | |
| یولیو/تەمموز 1942 | |
| ئوگست/ئاب 1943 | 900000 |
| مایدانك | |
| ئوکتۆبەر/تشرینی یەکەم 1941 | زۆرتر لە 360000 |
| یولیو/تەمموز 1944 | |
| ئوشفیتز ـ بیرکناو | |
| ینایر/کانوونی‌دووەم 1942 | زیاتر لە یەك ملیۆن و سەدهەزار |
| ینایر/کانوونی دووەم 1945 | |

((پەراوێزی وێنەیەك)) وێنەی ل 54

## تربلینکا کارگەی مردن

گەیشتن بە تربلینکا، دروستکراوەی ژوورەکانی گاز دەکەوێتە دەرەوەی وێنەکە لە لای چەپەوە، بەڵام ئەوەی بە رێگای گەشتی ئاسمان بە ژوورەکانی گاز دەناسرا لە گۆشەی دووری بیناکەی زیندانە درێژەکەی لای چەپەوە دەست پێدەکات.
لەم گۆرەپانە گەورەیەدا کاری ئەوەیان دەکرد کەوا جیایەك کەلوپەل و کەرەستە تایبەتیەکان ئەوانەی لە خەڵکەکە وەرگیراوە کە هاتوون جیاکەنەوە. لە پشتەوە گۆرهەڵکەندنێك دیارە کەوا گۆری بە کۆمەڵیان لێدەدا، نزیکەی یەك ملیون کەس رەوانەی ئێرە کرا هەموویان کوژرا بێجگە لە سەد کەس رزگاریان بوو.
ئەم نەخشەیە لە لایەن ساموئیل ولینبیرك دروستکراوە، ئەویش لەوێ گیرابوو لە کتێبی (( یاخی بوونێك لە تربلینکا )) Treblinka Rovoltin بڵاو

کراوەتەوە. دەبوایە ژنان پێش ناردنیان بۆ ژووری گاز قژیان ببڕن و هەروەها کەلوپەلە تایبەتیەکانی کوژراوەکانیش جیادەکرایەوە و دوایش ڕەوانەی ئەڵمانیا کرانەوە. هەروەها ولینیبرگ بەشداری سەر هەڵانەکەی تربلینکای کرد کە لە 2 ئوگست/ئابی 1943 کردبوو. گەرایەوە وارشۆ وبەشداری بزافی بەرگری پۆلونی کرد و سەرهەڵدانەکەی ئوگست/ئابی 1944 بەشداری کرد.

## فرانز ستانجل

لە دیدار و دانوستانەکاندا ئەوە زۆر دەوترا کە پرۆسەی قڕکردنەکە ئارەزووی (( ئەو بکوژانەی پێش کورسیەکان بوو )) ئەوانەی کە مەکینەی کوشتنەکەیان دەسوراند و پارێزگارییان لێدەکرد. بەڵام نابێ مرۆڤ ئاسۆی بینینی خۆی گوم بکات. وەك ئەو مێژوونوسە کروستوفر براونێنگ نوسیویەتی (( لە کۆتاییدا قڕکردنەکە رویدا چونکە لە سەر ئاستێکی گەورەی بایەخدارە کەسانێك ژمارەیەکی زۆری خەڵکیان بە درێژایی ماوەیەکی زۆر کوشت )).

سەرکردەی ئوردوگاکانی قڕکردنیش مرۆڤ بوو، وەك ئیمە بوون، سەرەتا فرانز ستانجل سەرکردەیەك بوو لە سوبیبورو دوایش لە تربلینکا لە شێستەکاندا لە برازیل گیرا و گەڕاندرایەوە ئەڵمانیا و بە تاوانی کوشتنی سەدان هەزار کەس تاوانبار کرا. هاوکات کەوا ستانجل سەرکردەی پرۆسەیەکی گەورەی کۆمەڵکوژی دەکرد، ئەویش باوك و مێرد بوو، ئەم برگانە لە بزارێك دەدوێت ئەگەر رووی نەدابایە. بۆیە پرسیارەکە لە کاتی شەڕەکە نەکرا، رۆژنامەنوسێك لە دیداری ژنی ستانجل ئەم پرسیارەی ئاراستەی کرد (( دەکرێ بۆمان بدوێیت (.....) سەبارەت بەوە ئەگەر مێردەکەت ناچار کرابایە بەوەی (( من بارەکە زۆر بە ترسناك دەزانم، یان واز لەو کارانە دەهێنی کەوا جەستە دەهەژێنێ یان لەمن و منداڵەکان )) تریسا ستانجل وەڵامی دایەوە (( بڕوا دەکەم کە من سەرپشکم کردبایە لە نێوان ـ تربلینکا و من، بەڵێ(.....) دەبوو، ئەگەر مەسەلەکەم لە سەر مەحەك دانابایە منی هەڵدەبژارد )).

بەڵام ژنەکەی هەر بە خۆڕایی یارمەتیدا بۆ کوشتنی زیاتر لە نیو ملیون کەس.

## فڕکردن بە کارکردن

کارکردن شێوەیەکی فڕکردن بوو کەوا ئەڵمانیەکان بۆ لە ناوبردنی گیانی زیندانیەکان بە کاریان دەهێنا، زیندانیەکان بەکاری زۆر زەحمەت خەریک دەکران. ئەوە و کەمی خواردن و زەرووفی تەندروستی زۆر خراپ و درندەیی پاسەوانەکان و سزا فورسەکان بۆ بچوکترین (( هەڵە )) بوونە هۆی رووداني زۆرترین زیان لە نێوان زیندانیەکان لە ئوردوگاکانی گرتن و کارکردندا.

جوزیف شوباکی گیراو لە ئوردوگای فڕکردنی مایدانك (( کارکردن ))ی گران لە ئوردوگاکە.(( دوایی چووینە )) کارکردن لە گۆشەیەکی کێڵگەیەك کۆیان کردینەوە، دوو قاپقاپمان لە پێبوو، بە قامچییەکانیان لێیان دەداین، زۆر جار چاکەت و کڵاو پانتۆڵەکانیان پڕ بەرد و قووری تەڕ و قوڕ دەکردین و لە سەریان دەداین، بارەکانمان لە گۆشەیەك بۆ گۆشەکەیتر پێیان دەگواستینەوە ، هەروەها بە پێچەوانەش، بارەکەمان دادەگرت و دووبارە بارمان دەکردەوە، ناچاریان دەکردین بە ناو پیاوانی ئەس ئەس گوزەر بکەین و لێیان دەداین، ئەوەش دۆزەخێك بوو بۆ خۆی )).

(( یەکەم جار تا سێ بەیانی ئامادەی کارێکی لەم جۆرە ببم، ئەگەر بەراورد بکرێ بڕوا دەکەم (( دۆزەخ ))ی دانتی تەنیا کۆمیدیایە. بە فشە ئوشفیتز ناونراوە ئوردوگای فڕکردن )).

(.....)

بەشدار بوون لەم جۆرەکارانەی بەرامبەر ژنە گیراوەکان لە ئوردوگای ژنان (.....) کارێکی بەراستی ترسناکە، من هاوبیرم لە گەڵ تیلو کە هێمای دەدا کەوا گیلەمان لە قوڵای پاشماوەی جیهانە ( دبری جیهان ). لە رۆژانەی یوهان بێکریمر ، دکتۆری ئەس ئەس لە ئوردوگای فڕکردنی ئوشفیتز . بیرکناو لە 5ـ2/ سپتمبر/ ئەیلول 1942.

هەر لە ساڵی 1940 وە ئوشفیتز کرایە ئوردوگایەکی گرتن بۆ زیندانە سیاسیە پۆلونیەکان، ئوردوگاکە دەکەوێتە نزیکەی خاڵی بە یەك گەیشتنی گەورەی هێڵەکانی ئاسنی شەمەندەفەر . بە خێرایی ئەم ئوردوگایە بووە گەورەترین کۆمەڵگا کە چل ئوردوگای دەگرتە خۆ. لەم شوێنەدا چەند دکتۆر کاری چالاکی تاقیکردنەوەی تەندروستیان ئەنجام دەدا، ئوردوگا ناسراوەکان ئەوانە بوون ئوشفیتز(( ستاملاجر )) ئوشفیتز2 ( بیرکناو ) و ئوشفیتز ( مونوفتیز ).

گیراوەکان لەبەر برسیەتی و کەمی خواردن و نەخۆشیەکان و کاری کۆیلەتی و جەزرەبەی جەستەیی و نەفسی دەیانناڵاند. لە کۆتایی 1941دا کاری کوشتنی بە کۆمەڵ بە گاز لە ئوشفیتز دەستی پێکرد.دوایی لە بەهاری 1942دا ئەم کارە گواسترایەوە بیرکناو کارەکە لە دوو ژووری گازی کاتی ئەنجام درا کە لە خانوێکی نیشتەجێی جێکرابوو. لە بەهاری 1943دا کاری دروستکردنی سوتانگەکان لە بیرکناو تەواو بوو. بە گەیشتنی جولەکەکانی هەنگاریا لە بەهار و هاوینی 1944دا ژمارەی کوشتنەکان گەیشتە لوتکە، رۆژانە سێ چوار کاروان دەهاتن کە ژمارەیان لە نێوان سێ هەزار و سێ هەزار نیو دەبوو. یەك لە دەی ئەم ژمارەیان بۆ کار کردن راگرتن و ئەوانی تریان کوشتن، سوتانگەکان بەرگەی ئەو خەڵکە زۆرەی نەدەگرت کە بەو تەوژمە زۆرەوە دەهاتن بۆیە تەرمەکانیان لە ناو چاڵدا دەسوتاندن.

دوا کوشتنی بە گاز لە پایزی 1944 ئەنجام درا، پێشگەیشتنی سوپای سووری یەکێتی سۆڤیەت بە ئوشفیتز . بیرکناو لە 27ی ینایر/کانوونی دووەم 1945 هێزەکانی ئەس ئەس زوورەکانیان هەڵوەشاندەوە و ئەوەی مایەوە تەقێندرایەوە. بێجگە لەوەی لە سەرانسەری ئەوروپادا نزیکەی یەك ملیون جولەکە کوژران لە ئوشفیتز 75 هەزار پولندی و 21 هەزار قەرەج و 15 هەزار دیلی شەڕی سۆڤیەتی و 15 هەزار گیراوی ناسنامەکانیتر ، سەرجەم کوژراوەکان لە 101 ملیون کەس کەمتر نەبوون.

**چەند وێنەی بیرکناو لە کتێبێک**

A. بەشی باکووری شۆستەکە ( ل 58 ).

B. ژن و منالەکان لە دەرەوەی سوتانگەی 2 ( ل 59 ).

C. ژن و منالەکان لە رێگا بەرەو سوتانگەی 4 یان 5 ( ل 60).



D. وێنەی بەرگەکە شوێن و دروستکراوە گرنگەکانی ئوردوگاکە.

1. شۆستەی دەست نیشان کردن.
2. سوتانگە 2 لە گەڵ ژووری گازی ژێر زەوی.
3. سوتانگەی 3 لە گەڵ ژووری گاز لە ژێر زەوی.
4. سوتانگەی 4 لە گەڵ ژووری گاز.
5. سوتانگەی 5 لە گەڵ ژووری گاز و چاڵێك بۆ سوتانگەکە.
6. (( ساونا )) ناونووسکردنی گیراوەکان.
7. (( کندا )) ریز کردنی بەرجەستەکراوەکان.
8. زنجەکانی نەخۆشەکان.
9. ئوردوگای خێزانی قەرەجەکان.
10. ئوردوگای پیاوان.
11. ئوردوگای ژنە جولەکە هەنگاریەکان.
12. ئوردوگای خێزانەکانی تیریزنیشتاد.
13. ئوردوگای ژنان.
14. دروستکراوی تاقیکردنەوە تەندروستیەکان.
15. (( دەروازەی مردن )) دەروازەی شەمەندەفەر.

دەست نیشانکردن. یەکێکە لەو وێنە زۆرانەی کاتی دەست نیشانکردن لە سەر شۆستەی بیرکناو . چەند لە رزگار بووەکان دیمەنی کۆتایی هێنان بە خێزانەکانیان بینیوە، دکتۆرەکانی ئەس ئەس و ئەفسەرەکانی‌تر ئەو کەسانەیان لە ئوردوگاکانی کار هەڵدەبژارد کەوا بۆ کار دەهاتن. لە بەشی سەرەوەی وێنەکەدا کاروانێك لە دەست نیشانکراوەکان دیارن کەوا زۆربەیان منداڵ ژن و پیرن بە رێگاوەن بۆ ژوورەکانی گاز لە سوتانگەی 2.

## دووسەد وێنە کە لە بیرکناو

رێگا نەدرا وێنەی (( دوا چارەسەری کێشەی جولەکە )) بگرێت. بەڵام زۆر ئەم بەرەبەست و قەدەغەیان بڕی ، بە تایبەتی لە کاتی ئەنجامدانی لە سێدارەدانی بە کۆمەڵی بە گولە بارانکردنیان. هەندێ لە وێنەکان لە لایەن سەربازەکان گیراون کە بۆ خانەوادەکانیان رەوان دەکردنەوە یان لە کاتی مۆڵەتیان نیشانەی هاورێکانیان دەدران. بە دەگمەن وێنەکانی ئوردوگاکانی قڕکردن پارێزراون.

بۆیە ئەلبومی Umsiedlung der Juden aus Ungarn گواستنەوەی جولەکە لە هەنگاریا دەبێتە بەڵگەنامەیەکی دەگمەن. ئەوەش لە یادی کۆتایی هاتنی شەڕدا لە یەکێك لە ئوردوگاکانی گرتندا دۆزرایەوە، مەزندە دەکرێت وێنەکان لە کۆتایی مایو/ئایار یان سەرەتای یونیو/ حوزیرانی 1944دا گیراون چونکە لەو کاتانەدا بوو کەوا گواستنەوەی جولەکە لە هەنگاریا زۆر بوو. کێ و بۆچی ئەو وێنانە گیراون کەس نازانێ، وێنەکانی بە گوێرەی رۆژەکان رێز کراون و بە دەستی لە ژێرەوەیان نوسرابوو. یەکەم ناونیشان (( گەیشتنی شەمەندەفەری گواستنەوە )). پاش ئەوە و یەك لە دوای یەکدا، (( جۆڵکردن ))، (( ئەو پیاوانەی هێشتا کەڵکی ئەوەیان ماوە سوودیان لێوەربگیرێت)). (( ئەو ژن و منالانەی هیچ پێویستیمان پێیان نیە )). (( بارکردنەکە بۆ ئوردوگاکانی کارکردن )) و دوایش (( سەرمایەکان )). پاش دوا ناونیشان چەند وێنەی کەل وپەل و پێلاوی زۆری تێدایە....هتد. لە کۆتاییدا دوو وێنەی سوتانگەیەکە لە ئوردوگایەکی بچوکی گرتندا. ئەو پیاو و ژنانەی (( ئەوانەی دەکرێ سوودیان هەبێ )) گەنج و بەهێزن، بەڵام ئەوانەی (( پێویستیمان پێیان نیە )) پیر و کەم ئەندام و ژنی منداڵدار بوون ، ئەو پیر و کەم ئەندام و ژنە منداڵدارەکان بۆ راستەوخۆ ژوورەکانی گاز بەرێ کران، لە وێنەی بەرگەکە و وێنەی لاپەرەیە و لاپەرەی

دوایی‌تر له وێنه‌كانی (( چۆڵكردن ))ن و ئه‌وانی‌تریش له ناونیشانی (( ئه‌و ژن و منداڵانه‌ی هیچ پێویستیمان پێیان نیه )) وەرگیراوە.

جیاكراوەكان له دەرەوەی شوورەی سوتانگەكانی 2 راوەستاون، ره‌نگه هه‌ر یه‌ك سه‌عاتیان لـه ژیانـدا مابێ، ئـه‌و ژن و منداڵانـه بـه خنكانـدن دەكـوژرێن و پـێش كۆتـایی رۆژەكـه لاشـه‌كانیان دەبێتـه خۆڵـه‌مێش ، ئـه‌وەش بـه پرۆسـه‌یه‌كی پیشه‌سازی بـه بەرنامـه دەكرێت. لـه‌و شـوێنه‌ی لێوەی راگـیراون بـه نـاو باخـچه بچوكه‌كه و به قالدرمه‌یه‌ك بۆ ژووری جل داكه‌نانـدنیان دەبـەن و له‌ویشه‌وه بۆ ژوورەكـه‌ی تەنیـشتی كـه 2000 كـه‌س دەگرێـت . دوایـی دەرگـا ئه‌سـتوورەكه دادەخرێت، رووناكی دەكوژێتـه‌وه و چـه‌ند دنكه زیكلون بـی لـه كـه‌ڵ سـیانیدی هایـدروجین دەتەقێنـدرێت. پـاش هـه‌وا گـۆڕینی ژوورەكـه گـیراوه جولەكـه‌كان تەرمـه‌كان بـۆ سـوتاندن لـه فرنـه‌كانی سـوتانگه‌كه دەردەهێـنن، ئـه‌م پرۆسـه‌یه هه‌مووی سه‌عاتێك دوو سه‌عات زیاتر ناخایەنێ.
(( له شه‌قامی گه‌یشتن پێنج پێنج كه‌س دەڕۆیشتن، ئـه‌ویش شـه‌قامی دەرچوونه به‌ڵام نازانن، مرۆڤ یـه‌ك جـار دەروات. زۆر جـوان دەرۆن نـه‌وەك هه‌ڵمه‌یـه‌ك بكـه‌ن، دەگه‌نـه بینایـه‌كی گـه‌وره و هه‌ناسـه‌یه‌ك دەدەن، كـه‌وا لـه كۆتاییـدا گه‌یـشتن. بـه رووی ژنه‌كانـدا هـاوار دەكـه‌ن بـۆ جـل داكه‌نانـدن، سـه‌رەتا جلـی منداڵـه‌كانیان بـه هێمنی دادەكه‌ن تـا لـه خه‌وەكه‌یان بـه ئاگانێن. ژنـه‌كان لـه بـه‌ر سـه‌فه‌ری چـه‌ند رۆژەیان هه‌ست به بێزاری و نیگه‌رانی دەكه‌ن.
له‌بـه‌ر چـاو كراوەیـی منداڵه‌كانـدا ژنـه‌كان جلیـان دەدەكـه‌نن، كـه هـه‌ر یـه‌كێكیان خاولیه‌ك وەردەگرێ له ناوەكه دەپرسێ نه‌وەك له به‌ر منداڵه‌كانیان گه‌رم نـه‌بێ و سـه‌رمایان بـێ. كـه پیـاوه رووتـه‌كان بـه دەرگایـه‌كی‌تر دێنـه ژووری بـاوەش لـه منداڵه‌كان دەكه‌ن.ره‌نگه ئه‌و كاته هه‌موویان تێبگه‌ن )).

شارلوت دیلبو



## شەش سەد منالە ساواکە

سالمن لیفنتال یەکێکە لە ئەندامانی دەستەی ئەبەرئییەکان Sonder Kommando

پشکنینی لوولەیی تەندروستی لە رووداوێك دەدوێت کە لە ئۆردوگای ئوشفیتز ـ بیرکناو لە 20 ئوکتۆبەر/ تشرینی یەکەمی سالی 1944 رووی داوە. دەقی نوسراوەکەی لە نزیك یەکێك لە سوتانگەکانی ئوردوگاکە لە ناو خۆڵدا دۆزراوەتەوە.

(( بە رووناکی رۆژێك 600 منالی ساوای جولەکەی تەمەن لە نێوان 18ـ 12 سالانیان بۆ ناردم . جلی زیندانی درێژی تەنکیان لە بەر بوو، پێلاوی دڕاو و قاپقاپی داریان لە پی بوو، (.....) کە گەیشتنە شوێنەکە سەرکردەی دەستەکە

فەرمانیدا خۆیان رووت بکەنەوە، منداڵەکان بە دیتنی دووکەڵەکە زانییان بەرەو مردنیان دەبەن نیگەرانی دڕندانەیان لێ بەدەرکەوت و لە جێگاکە دەخولانەوە و قژی خۆیان رادەکیشا نەیاندەزانی بواری دەرباز بوون لە کوێیە.
زۆریان بە کوڵ گریان، هاوار و گازاندە گوێ ئەدراوەکانیان دوور دەڕۆیشتە (....).
لە ترسی مردنیان زوو جلەکانیان داکەنااند، رووت و پێخواس لە نزیک یەکترا خۆیان گرمۆڵە کرد و بێ جوڵە ریز بوون. منداڵێکی ئازا هاتە پێشی سەرکردەکە و لە تەنیشتی راوەستا و پاڕایەوە و داوای کرد بواری ژیانی بدات و ئامادەیە هەموو کارێکی قورس جێبەجێ بکات بەڵام تۆبزە ئەستوورەکەی لە سەری دا.
زۆر لە منداڵەکان بەرەو جولەکەی ئەبەردییەکان غارییان داو خۆیان پێیان شۆڕکردەوە و بۆیان چەمانەوە و پاڕانەوە تا لە مردن رزگاریان بکەن، هەندێکیان ( لە ترسی مردن ) لە شوێنە گەورەکە رایان دەکرد. سەرکردەکە داوای لە یەکێکیان کرد کە تۆبزی لە دەست بوو پارمەتی بدات.
بە تێپەر بوونی چەند دەقیقەیەك دەنگی مێردمنداڵەکان هات و دوایی دەنگەکە بووە گریانێکی تاڵ. گریان و نوزانەوە ترسناکە لە هەموو شوێنەکان دەبیسترا، بە گریان و نوزانەوەکان لە شوێنی خۆیاندا مۆرهەڵگەراییەن. پیاوانی ئەس ئەس دەم بە پێکەنین و دڵشاد لە سەر سەریان راوەستابوون بەبێ ئەوەی ئاگاری ژانیان لێ دیار بێ. وەك سەرکەوتوونێك و بە شانازییەوە خۆیان دەنواند.
بە لێدانێکی کوشندەوە بەرەو ژێرزەمینەکەیان راپێچان. (....)
هەندێ لە منداڵەکان هەر بە هیوای رزگار بوون غاریان دەدا، پیاوانی ئەس ئەس بەراکردن لە دوایاندا و بە لێدانی وەحشیانە و هەموویان گرتن و کۆیان کردنەوە و لە ژێرزەمینەکەیان کردن. دڵشادییان باسی ناکرێت. دەبێ منداڵیان نەبێ ؟!

## کارکردن لە جەهەنەم

ئەڵمانییەکان بەو جولەکانەیان دەووت دەستەی ئەبەردییەکان، ئەوانەش ئەو گراوانە بوون کە ناچار دەکران هەرچی کاری کەم و شەرمەزاری هەیە بیکەن، ئەو کەسانەی دابڕابوون. چونکە نهێنی ترسناکیان دەزانی ، کاری ئەوان

(( بەتاڵکردنی )) ژوورەکانی گاز بوو. دەرکێشانی کیفکی زێری ددان و بڕینی پرچ و دواییش سوتاندنی لاشەکان لە سوتانگەکانی یان لە چاڵەکان، ژیانی ئەم دەستەیە کورت بوو، ئەوە رۆژ بە رۆژ و بە بەردەوامی بە کەسانی تری (( مردووە زیندووەکانیان )) دەگۆڕینەوە، یەکێکیان ووتی: ((دەمتوانی بەربەستێك بۆ ژیانم دانێم ، بەڵام ئارەزووی مانم هەبوو تابتوانم تۆڵە بکەمەوە و شاهید بم لە سەر رووداوەکان، هەست نەکەن ئێمە درندەین ئێمەش وەك ئێوەیین، بەڵام ئێمە بێزارترین )).

یەکێك لەوانەی لە سەر ژیان مابوو نوسەری ئیتال بریموليفی وەك چۆن رایگەیاند (( بیرۆکە و رێکخستن Sönder Komman do تاوانی گەورەی سوشیالیستە نەتەوەپەرستەکانی زۆریش تیانیە. (...) ئەم رژێمە ئەوە دەگەیێنێ کەوا گوناحی تاوانەکانی کەسانی‌تر بگوازنەوە ئەستۆی هی‌تر - ئاشکراتر بۆ قوربانیەکان ـ لە پرسەکانیان رووت دەکرێنەوە بەوەی کەوا بێ‌تاوانن )).

لیفی دەڵێ دەستەی نەبەردییەکان یەك واتای هەبوو ئەویش (( ئێمە، میللەتی دەسەڵاتدار، کێ دەتانروخێنێ، بەڵام ئێوە لە ئێمە چاکترنین، ئەوەیە گەربمانەوێت، ئەوەیە کە دەمانەوێت، دەتوانین بتانروخێنین نەك تەنیا جەستەتان و بەس، بەڵکو گیانتان، وەك چۆن گیانی خۆمان رووخاند )).

وەك چۆن لیفی وتویەتی قبوڵکردنی نازییەت و کردنی بەمنارەیەکی بەخشندەیی بەرەو بۆگەنی ناوەوەی تاریکیمان دەبات.

## سەرهەڵدان لە گیتودا

سەرەڕای هەموو ناهەموارییەکانی ژیانی نامرۆڤایەتی لە گیتوی وارشۆ سەرهەڵدان و بەرگری و نارەزایی دەکران. لەم وێنەیەدا چەند خەباتگێرێکی بەرهەڵستی دیارن، سیما روتم کەوا توانیویەتی لە رۆژانی سەرهەڵدانەکاندا ڕا بکات و دەربازی ببێت دەگێڕێتەوە.

(( سێ رۆژەکەی یەکەم لە شەڕەکاندا جولەکە سەرکەوتوو بوون، ئەڵمانیەکان بۆ دەروازەکانی گیتو بریندارەکانیان راکێشا و هەڵاتن لەوێی و لە دەرەوە، هەموو شتیان کرد، بە تۆپ و بە فرۆکە بۆمبارانیان کرد، نەمانتوانی خۆمان بەرامبەر

فرۆكەكان و ئاگری چڕیان راگرییین كە دژ بە گیتو كە بە كار هات، گیتو یەك پارچە ئاگر بوو و دەسوتا (...) بڕوا ناكەم هیچ زمانێ هەبێ بتوانێ پێناسەی كاتەكانی ئەو ترسانە بكات كە دەمان چێژا، لە شەقامەكانی گیتو، گەرچی بە شەقام ناوی دەبەیین. بەلام لە راستیدا شەقام دیار نەمابوو. لە سەر كۆمەلی لاشەكاندا بازمان دەدا، جێگا نەمابوو رووی تێ بكەیین. سەرەرای ئەوەی دژ بە ئەلمانیەكان شەرمان بوو و پەیوەندییمان بە دونیای دەرەوە هیچ نەمابوو. دوور و دابڕاو لە هەموو شتێ و لەوانەی لە چوار دەورمان هەبوون. گەیشتینە ئەو رادەیە كە هیچ پێویست نەدەبینرا شەڕەكان بەردەوام بێ، بیرمان لەوە دەكردەوە دەرزێك لە بەشی ئاری وارشۆ دڕ بدەیین و بتوانین لە گیتو دەربچین.(....)

لە بەیانی زوو و بە رووناكی خۆمان لە شەقامەكان دۆزییەوە. بهێنە پێش چاوت كەوا لە مایو/ئەیاری خۆر لە دەرەوە، ئێمە لەوێ لە ناوەندی شەقامدا، راوەستاوین خۆمان بە نامۆ دەزانی لە نێو خەلكی ئاسایی، ئێمە لە ئەسرەگەزیەكی ترەوە هاتبووین.(....)

لە چوار دەوری گیتو پۆلونی گومان لێكراو هەبوو جولەكەی دەگرت و بە سەرسورمان لە دەستیان رزگارمان بوو. ژیان لە بەشە ئارییەكەی وارشۆ ئاسایی بوو، وەك جاران بوو، قاوەخانەكان وەك جاران كاریان دەكرد، چێشتخانەكان ، پاسەكان و عارەبانەكانی ترموای و سینماكان، گیتو دوورگەیەكی دابڕاو بوو لە ناوەندێكی ژیانی ئاساییدا.

## بەرهەلستی و كۆمەك

یەكێك لە ئەفسانەكانی فڕكردن رۆیشتنی شەش ملیون جولەكە بوو (( وەك بەرخ بۆ سەربڕین )) بەبێ بەرهەلستی. بەلام لە راستیدا نموونەی هەزارەها بەرهەلستی هەبوو، وەك سەرهەلدانەكەی گیتوی وارشۆ و دەستەی پێشمەرگەكانی جولەكە و هێرشەكانیان دژ بە یەكەكانی ئەلمانی لە خۆر ئاوا و خۆرهەلاتی ئەوروپا، لە ئوردوگاكانی فڕكردن و گرتندا بەرهەلستی هەبوو كەوا گیراوە جولەكەكان و كەسانێتر ئەنجامیان دەدا، ئەلمانیەكان زۆر دڕندانە و بێ وێنە هەموویان دەكوشتن.زۆر لە بەرهەلستیەكان گەنجەكان دەیانكرد و گیانیان

دەخستە مەترسی. نەك هەر ژیانی خۆیان بەڵكو ژیانی باوك و خوشك و براكانیان و ژیانی سەدان كەسانی تر. تیمەكانی كار لە گیراوەكان دەیانزانی راكردن كاری خراپ دەكاتە سەر براكانیان لە گێژاوەكە و گیراوەكانی زیندانەكانی توردوگاكان دوو دڵ دەبوون گەرچی سوور دەیانزانی دوارۆژیان زۆری نەماوە. ئەو بڕیارەی كە زۆر رەچاو دەكرا ئەوە بوو كەوا ئارەزوویان لە ژیانە، یان هەر هیچ نەبێ بە شەرەفی بمرن. داوای رێكخراوی جولەكەیی خەباتگێر لە گیتوی وارشۆ لە یەكێك لە سەرهەڵدانەكانی ینایر/ كانوونی دووەم/1943دا بەم جۆرە بوو:

(( لە كاروانی چۆكدان بۆ مردن مرۆڤ ئازاد نابێت، وەك بردنی بەرخە بۆ سەربڕین، مرۆڤ بەشی زۆر گەورە و گەورەتر دەتوانێ ئازاد بێ لە خەباتدا، ئەوەی بەرهەڵستی كرد بوار بۆ رزگار بوونی دەبێت. ئەوانەی وازیان لە بەرهەڵستی هێنا وازیان لە خۆیان هێنا، ئەوەیان پێشەكی هەڵوێست دۆراندنە. با مرۆڤ بە ئاگا بێت لە راستی ئەویش خەباتە! ئێمەش دەمانەوێ بژیین، ئێمە مافی ژیانمان هەیە،(.....) بابە ئاگابێین و بۆ ژیانیان خەبات بكەین )).

لە ئەوروپای خۆرهەڵاتدا دەستەكانی بەرهەڵستی لە سەد گیتودا هەبوون. بەڵام ئەو دەستەیەی كە زۆر ناسرابوون ئەو دەستە پێشمەرگانەی دارستانەكانی ئەوروپای خۆرهەڵات بوون. ژمارەی ئەو جولەكانەی لەم دەستانەدا شەڕیان دەكرد نزیكەی دەگەیشتە 20 هەزار كەس دەبوون هەندێك لەوانە ئەو خێزانانە بوون كە توانیبویان خۆیان دەرباز بكەن، بەڵام بەرهەڵستی لە ئەوروپای خۆرئاوادا تەنیا لە فرنسا و بلجیكا هەبوو. دەستەكانی پێشمەرگەكان جولەكەی زۆریان شاردەوە. زۆر منداڵ توانیان لە حەشارگەیەك لە كەنیسەیەك یان لای خێزانێكی مەسیحی لە پۆلونیا و هۆلندا و فرنسا بدۆزنەوە و زۆریان ژیانیان بە پێی رێنماییەكانی ئایینی مەسیحی بەرێوەدەبرد، ئەڵمانیەكان یاسای تاوانی توندیان دەركرد دژ بەو كەسانەی (( تاوانی )) شاردنەوەی جولەكە ئەنجام دەدەن. سەرەرای ئەوەش كەسانی وا هەبوون دژایەتیان كرد و بە پێی ویستی خۆیان كاریان كرد.

جۆرێكی تری بەرهەڵستی رزگار بوون و دوورخستنەوەی جولەكە بوو بۆ ئەو ناوچانەی لە ژێر دەستەڵاتی ئەڵمانیا نەبوو، ئەوەش ئاسان نەبوو ، وڵاتەكان

زۆریـان بـۆ نموونـه سویـسرا سـنووری داخـستبوو و زۆر جـار ئـەو جولەکانـەی دەگەیـشتنێ دەگـیران و رەوانـە دەکرانـەوە، هەنـدێ لـە جولەکـە بـە ڕێگـای دوور گەیـشتنە فەلەسـتین، هەنـدێکیان لـە جێگـای دووری وەك شـنگهای دۆزییـەوە کـە دەکەوتـە ژێـر دەسـتەلاتی یابانیـەکانی هاوپەیمانی ئـەڵمانیا لـە شـەڕەکەدا، بـەلام ئەوان ئایدلۆژی ئەلمانیان نەبوو دژ بە جولەکە.

(( هەموو شتێ دەکرا بکرێتە بەرهەڵستی، چونکە هەموو شتەکان قەدەغە بوون، هەر جولەکەیەکی گیراو هەستی بە کەسایەتی خۆی و رەسەنی کردبایە ئـەوەش بەرهەڵستی بوو )) ئەندریا دقوتو، دەروونناسێکی ئیتالی

(( ئەو دەمە بە رووسی وتی: هاورێکانم ، ئەوە جوانترین رۆژی ژیانمە لێرە کە بە چاوی خۆم ئەو دەستە گەورەیـە دەبینـم کەوا لە گیتـو دەرچوون! من بـەڵێنیان پـێدەدەم، ئێمـە دەمـرین تـا لـە ژیانـدا بمێنـین، کۆشـش دەکـەین ئـەوەی پێمـان دەکرێـت زۆرتـرین خـەلك رزگـار بکـەین، ئیـشەکە وا دەروات، ئێمـە جیـاوازی ناکەین، ئێمە ژن و پیر و منالان لە ناو نابەین، ژیان زەحمەتـە، ئێمـە بـەردەوام ژیانمان لە مەترسی دایە، بەلام ئەگەر تەواو بووین، ئەگەر مردین، دەمرین بەلام بە مرۆڤی دەمرین)).

موشی بایراش،یەکێکە لە ئەندامانی ئوردوگای خێزانی بیلسکی

جولەکـەی پۆلـونی (( توڤیابیلـسکی )) لـە سـەرەتای داگیرکردنـی ئەڵمانیاکانـەوە خۆی شاردەوە، چەند دەسـتەی خـەباتگێری لـە دارسـتانەکانی خۆرئـاوای روسـیای سپی لـە خـۆی کـۆ کـردەوە، بیلسکی بڕیاریـدا کـەوا چـالاکی ئـەم دەسـتەیە تـەنیا پارێزگاری لە گیانی خۆیان نەبێ و بـەس. کۆشـش و گـەرانیان کـرد بـە دوای ئـەو جولەکانەی ژیانیـان لێکەوتووەو هانیان بدەن تا بێنە نـاو ڕێزەکانیـان و دوایـیش دەستەکان بە نـاوی پێشمەرگەکانی بیلسکی ناسران. ئەو کەسەی لە ژێـر پاراسـتنی پێشمەرگەکاندا بوون لە ساڵی 1944دا ژمارەیان دەگەیشتە 1200 کەس لە ژن و پیاو و منالّ، دەستەکە بۆچوونی هەڵوێستی ئەویان رەچاو دەکرد کەوا پاراسـتن و

رزگار كردنی جولەكە باشترە لە كوشتنی ئەڵمانیەكان و دەستەكە تا كۆتایی شەڕەكە خۆی راگرت.
كە دارستانەكانی خۆرهەڵاتی پۆلونیا و خۆرئاوای یەكێتی سۆڤیەت لە لایەن ئەڵمانیەكان گیران چەندین نوردوگای خێزانیان دۆزیەوە، لەم دەقەی لای چەپدا موشی بایراش دووانی بیلسكی نوسراوەتەوە كە لە دارستاندا پێی راگەیاندبوون.

## سەرهەڵدانەكەی گیتوی وارشۆ

كە زیاتر لە 250 هەزار جولەكە لە وارشۆ بۆ تربلینكا دوورخرایەوە بۆ ئەندامانیتری بەرهەڵستی جولەكەی كەمابوون بۆیان ئاشكرا بوو كەوا هیچ بژاری تر بێجگە لە شەڕی چەكداری نیە. لە 18 نیایر/كانوونی دووەمی 1943دا هێزەكانی ئەڵمانی هاتنە ناو گیتوكە بۆ دوورخستنەوەی ئەوانەی تری كە مابوون. بەڵام رووبەرووی بەرهەڵستی هاتن و راستەوخۆ هێرشیان كرایە سەر و تەقەش دروست بوو و یەكەم زیانیش لەوان كەوت، گەرچی ئەڵمانیەكان توانیان 6000 جولەكە كۆ بكەنەوە و دووریان بخەنەوە. بەڵام لە رووباندرا و گەرانەوە.
چەند مانگ دانیشتوانی گیتو تۆڵەیان لێ نەكرایەوە و بە ناسوودەیی ژیان، لەم ماوەیەدا، لە كاتی ئاگربەسەكەدا بزاڤی بەرهەڵستی توانی زیاتر لە سەد دەمانچە و هەندێ تفەنگ و رەشاش پەیدا بكات، بێجگە لەوانە نارنجۆكی دەستی و نارنجۆكی خۆمالیشیان هەبوو. 8000 ژن و پیاو بۆ شەڕێكی چاوەروان كراو و ئامادە بوون و سەنگەر و حەشارگەیان ساز دەكرد. لە 19/ئەبریل/نیسانی 1943دا سەرهەڵدان بە هاتنی ئەڵمانیەكان بۆ گیتو هەڵگیرسا. بە پاڵپشتی دبابە ئەڵمانیەكان هاتن ناو گیتو، بە بوونی بەرگرییەكی چڕ ئەڵمانیەكان ناچار بوون تەكتیكیان بگۆڕن و تۆپ و فرۆكە بەكار بێنن. مردخای ئەنیلیڤتش یەكێكە لە سەركردەكانی سەرهەڵدانەكە لە رۆژی شەشەمدا نوسیویەتی:
(( یەك شتی شیاو هەیە، ئەوەی ئیمرۆ لێرە روویدا ئازایەتی زۆر بەدیكرا لەوەی چاوەڕێ دەكرا، ئەڵمانیەكان دووجار لە گیتو رایان كرد(.....) و زیانمان كەمە )).

ئەڵمانیەکان ماڵ مالیان سوتاند، ئەوانەی خۆیان شاردبۆوە بە ناچاری دەرپەرین و ئینجا تەقەیان لێدەکردن ، شەڕەکەیان لە گیتو سێ هەفتەی خایاند، یەکێك لە سەرکردەکانی بەرهەڵستی کە بە زیندوویی مابوو نوسیبووی: (( بەرگریمان کرد، ئەوەش وای کرد مردن ئاسانتر بێ و چارەنووسمان بارەکەی سووکتر بێ )).

هەرگیز مەڵێ تۆ بەدوا ڕێگادا دەرۆیت
سەرەرای ئاسمانە گرانەکان کە وەك قورقوشم رووی رۆژی شین دەگریت
ئەو ساتەی خەونمان پێوە دیبوو هەردێ
دەنگی ترپەی پێمان بەرز دەبێتەوە و هاوار دەکات، ئێمە لێرەیین!

گۆرانی Sog nit kejn mogl لە لایەن هیرش جلیك ( 1943 . 1920 ) ەوە نوسراوە، سۆزی گۆرانیەکە لە سەرهەڵدانەکەی گیتوی وارشۆ وەرگیراوە. لە ساڵی 1943 چوەتە ناو پێشمەرگەکانی گیتوی ڤیلنیوس و ئەم گۆرانیەی بوویتە سرودی پێشمەرگەی جولەکە.

(( کاتژمێر چواری تەواوە و بە دەستی ئاگادار کراینەوە کەوا راستەوخۆ بچینە گەراج و چەك وەرگرین. روداك من بلوك بەرپرسی پرۆسەی دابەشکردنەکە بوو دەبوایە ئەوانەی چەك وەردەگرن وشەی نهێنی (( مردن )) بڵێن و راستەوخۆ وەڵامەکە بە وشەی (( ژیان )) وەردەگرنەوە. (( مردن . ژیان )) (( مردن . ژیان )) ئەم وشانە بە خێرایی دووبارە دەکرانەوە و دەستەکان درێژ دەکران بۆ ئەو چەکانەی کە لە مێژبوو چاوەرێ بوون، تفەنگەکان ، دەمانچەکان، نارنجۆکەکانی دەستی، هاوکات هێرش بۆ سەر ئەو پیاو کوژە ناودارەکان لە گیتودا هەبوو، سەرکردە زلیر بە تەورداسێك هێرش دەکاتە سەر دوو پاسەوانی ئەس ئەس و خۆی دەگەێنێتە لای ئێمە و سەرکردایەتی وەردەگرێت، لە نزیك گەراجەکە مودەرعەیەکی ئەڵمانی راوەستابوو، روداك لە مێژبوو خەمی لەوە خواردبوو کە مودەرعەکە کار ئەکات و پشتی ئەوی کردە سەنگەر و تەقەی لەوێوە لە ئەڵمانیەکان دەکرد. گوللەکانی کورت میدلار و چەند سەگەکانی هتلری خست، دەستەی سودوڤیتز توانیان دەست بە سەر جبەخانەی چەکەکان بگرن و چەك بە سەر هاوڵاتیان دابەش بکەن، ئێستا دوو سەد چەکدارمان هەیە ،

هەندێك هێرشیان بە خاکەناز و تەورداس بردە سەر ئەڵمانیەکان و چەندین پیاومان کوژران و ئەڵمانیەکانیش دەکوژران و کەم کەسمان رزگاری بوو )).

ستانیسلاف کون ـ یەکێك لە بەشداربووانی سەرهەڵدانەکە و یەکێکە لە رزگار بووەکانی ئوردوگای تربلینکا.

## سەرهەڵدانەکانی ئوردوگاکانی قڕکردن

جولەکە گیراوەکان ئەوەیان چاك دەزانی کەوا ئەڵمانیەکان بوار نادەن لە ژیاندا بمینێین و هەموو کاتێ مردنیان لە پێشە بۆیە بەرگری و راپەرینی بێ وێنە لە ئازایەتی و کۆششی بێ هیوا هەبووە. پاش هەر راکردنێکی سەرکەوتوو گەرانی چڕیشی بە دواوە بووە، سەرەڕای ئەمانەش سێ سەرهەڵدان رووی دا. یەکەمیان لە تربلینکا لە ئاب/ئوگست/1943 و لە سوبیبور لە ئوکتۆبەر/تشرینی یەکەمی هەمان ساڵ و لە ئوکتۆبەر/ تشرینی یەکەمی 1944 لە بیرکناو.

سەرهەڵدانی تربلینکا لە نێوارەی 2ئوگست/ئاب سەری هەڵدا، چەند گیراو توانیان چەند پارچە چەکیان دەست بکەوێت و ئەوانی تریش بە تەورداس و خاکەناز و هەتا بە دەستەکانیان هێرشیان برد، چەند بینایی ئوردوگاکە سوتان. لەو ئاژاوەی کە دروست بوو حەوت سەد گیراو توانیان رابکەن و دوایی گیرانەوە و کوژران، ئەوانەی پاش سەرهەڵدانەکە و شەڕەکە رزگاریان بوو لە سەد کەس کەمتر بوون. ژوورەکانی گازەکان دوو هەفتە پاش سەرهەڵدانەکە دەست بە کار بوونەوە.

سەرهەڵدانەکەی سوبیبور لەوانیتر تۆکمەتر و بە رێکخستنتر بوو لەوێ چەندین پیاوانی ئەس ئەس و سەربازە ئوکرانیەکان هاوکارەکانیان کوژران. لە کۆی 550 گیراو دا 320 گیراو رایانکرد و لەوانە 170 کەسیان گیرانەوە و لە سێدارەدران و بە کۆتای هاتنی شەڕەکە تەنیا 48 کەسیان مابوونەوە ، پاش سەرهەڵدانەکە ئوردوگاکە داخرا. لە پایزی 1944دا کۆمەڵکوژی لە بیرکناو کەم بۆوە، ئەندامەکانی دەستەی ئەبەردییەکان زانیان چەند رۆژێکی کەمیان ماوە لە 7ی ئوکتۆبەر/تشرینی یەکەم توانرا سوتانگەی ژمارە 4 بەو تەقینەوانەی بە قاچاغ دەستیان کەتبوو بتەقێنەوە، نەزانرا کەس هەبوو بێت کەوا لەم سەرهەڵدانە

رزگاری بوو بێت. راستەوخۆ پاش سەرهەڵدانەکە سەرکردەی ئەس ئەس هملەر بڕیاری هەڵوەشاندنی ئەو ژوورە گازانەیدا کە مابوون و رووخێنران.

## بەرگری ئەڵمانیە مەدەنیەکان

گەرچی وڵاتی ئەڵمانیا وڵاتی تاك حیزبی بوو بەڵام هاوڵاتیە ئەڵمانیە ئاسایەکان توانیان بەرگری بکەن بۆ ئەمەش چەندین بوار هەبوو بزاریی هاوکاری نەکردنی لە یاسا لادەرەکان لە پێشی هەموو کەسێك بوو بەڵام کەم کەس هەبوون هەنگاویان بۆ دەنا بەرگری سست و لاواز بوو رژێم لێیان نەدەترسا سزاشی نەدەدان بەرگری زیندوو و بەکاری مەترسی راستەوخۆی لە سەر بکەرەکەی هەبوو. هێزەکانی گستابو لە بەرگری سلبی نەدەگەران و بە تەمایی ئەو هەزارەها (( زانیاریانە )) بوو کە لە لایەن هاوڵاتیانی ئاسایی ئەڵمانی لە سەر جیران هاورێی کاریان پێشکەشیان دەکردن بۆ ئەوەی دەستی تێوەردەن. رەهەندی زانینی گەلی ئەڵمانیا سەبارەت بە پرۆسەی کوشتن دژ بە جولەکە کێشە و ناکۆکی لە سەر بوو. بەڵام گومانیشی لەوە نەبوو کە خەڵکە ئاسایەکەش زانیاریان هەبوو. سەرەرای ئەوەش بەرهەڵستی و نارەزایی لە ناویاندا زۆر کەم بوو. شاهیدەکانی یەهوە ئەو دەستەیە بوون نارەزایان لە رژێم هەبوو و قوربانی گەورەشیان دا. رازیی نەبوو سوێندی وەفا هتلەر و ئەڵمانی نازیی بخۆن، بەرهەڵستیەکانیان دەتوانرا بە پارچە کاغەزێك ئیمزایانی لە سەر بێ لە سەزا دووریان بخاتەوە. بەڵام کەسیان ئەوەی نەکرد، لە ئەڵمانیادا بیست هەزار کەس پشتیوانی دەکردن. هەزارەها کەسیان راپێچی ئوردوگاکانی گرتن کردن ، بروا دەکرێت لە 25٪ لەوانە کوژرابن لە ناو گەنجەکاندا کۆششی دژ بە رژێم هەبوو نارەزایش لە بەزداربوون لە کەتیبەکانی هتلریش هەبوو. ئەم بەرهەڵستیانە لە ناو رێکخراوی رێگرەکانی ئیدل ڤایس و سوینج کس هەبوو ( ئەوانە رەخنەکانیان بە سەمای بەترسیان لە سەر ئاوازی مۆسیقای جازی ئەمریکی دەنواند ) گەرچی جار جار شەرە قسە لە نێوان رێکخراوی (( رێگرەکان )) و کەتیبەکانی هتلر روویدا بەڵام نازییەکان لە سەرەتادا کەمیان دەزانی بۆ مامەڵەکردنیان لە گەڵیان . لە پایزی 1944دا

نازییەکان چەند گورزیان لەم دەستانە وەشاند بەتایبەتی بۆ سەرکردەکانیان و زۆریان لە دار دان. لە نێوان یونیو/حوزیرانی 1942 فبرایر/شوباتی 1943دا دەستەیەك لە میونیخ بە ناوی گوڵی سپی هەبوون، بڵاوکراوەیان دژ بە نازییەت بڵاو دەکردەوە و نارەزایشیان لە کوشتنی جولەکە نیشان دەدا ، گستابو بە چالاکییەکانیانی زانی و ئەندامەکانی گوڵی سپی لە سێدارەدا. بزافی گوڵی سپی، دەستەیەکی نوێوزسیونی بچوك بوو، هەردوو برا سوفیا و هانس شول و مامۆستاکەیان لە زانکۆ کورت هوبر دایانمەزراند بوویەکێك لە ئەندامەکانی ئەلکسندر شموول لە دوا پەیامییدا نوسیویەتی! (( لە گەڵ هانس خەباتمان دژ بە رژێمی ئەڵمانی کرد، ئاشکرا بووین و لە سێدارە دراین )).

(( زۆرداری هتلر بێزاری کردین. بە پیوەندی کەلەپچە کراین. بەڵام سەعاتی ئازادی بەم زووانە زەنگ لێدەدات. ئەو کات پیوەندەکان دەپچڕێنین (....). کەتیبەکانی هتلر ورد دەکەین. ئیدل فایس لە کاروانا ـ کەس ناتوانێ بە مانچە مێنێتەوە )).

## نارەزایی روسن شتراسە

ئەو نارەزاییەی لە مارس/ئاداری/ 1943 کە لە شەقامەکانی برلین بە ئاشکرا کرا لە هەموو نارەزاییەکانیتر بەرچاو و شیاوی باسترە، رژێم دوو دڵ بوو لە دوورخستنەوەی ئەو جولەکانەی ژنیان جولەکە نیە ئەوەك نارەزایی و بەرگری پەیدا بێت ، بەڵام بوونی جولەکە لە برلین سەرچاوەی بێزار بوونی گەورە بوو بۆ وەزیری پروپاگەندە جوزیف گوبلز ئەوەی کە بڕیاریدا کەوا هەموو ئەو جولەکانەی لە برلین ماون دووربخرێنەوە، زوو دەرکەوت کەوا مەترسیەکەی نازییەکان لە جێگای خۆیدا بوو بەمە ژنان بەرهەڵستی گستابوو هێزەکانی ئەس ئەسیان کرد. هەزارەها ژن رژانە سەر شەقامەکان، بۆ نارەزایی چوونە پێش ئەو بەندیخانەیەی کە پیاوەکانیان تێدا گیرابوون، یەکێك لەو ژنانە شارلوت ئیسرائیل کە مێردەکەی گیرابوو وای گێرایەوە ژنەکان بە رووی پاسەوانەکاندا هاواریان دەکرد (( ئێوە بکوژن )) ، (( جارێك نا بەڵکو چەند جار هەتا شەنگمان

لە بەر بوو هاوارمان کرد )). نارەزاییەکان بەرهەمی هەبوو، زۆربەی پیاوەکان ئازاد کران. ڕێژەی 98٪ ئەو پیاوە جولەکانەی ژن هێنانی تێکەڵیان کردبوو بە کۆتای شەڕەکە لە ژیاندا مانەوە.



دوو منداڵی جولەکەی ئەڵمانی پاش هاتنیان لە ساڵی 1938 بۆ ئینگلترا. لە بەر ئەوەی هەموو ئەندامانی خێزانێك زەحمەت بوو پێکەوە مۆڵەتی چوون وەرگرن، بۆیە زۆر لە دایكو باوکان بریاری زەحمەتیاندا بە ناردنی منداڵەکان بە تەنیا بۆ ئەو شوێنانەی کەوا ئاسایش لێیە. پاش ئەوە کریستاڵیەکە بەربەستەکانی سەر پەنابەندە جولەکەکان سووك کرایەوە و بریاری تایبەتیش بۆ منداڵان هەبوو. ئەوەش بە دەگمەن هەندێ لە ئەندامەکانی خێزانی پاش شەڕەکە گەیاندەوە یەك.

# سوید بەرگری دەکات

ئەگەرچی مەبەستی نازییەکان کوشتنی (( هەر جولەکەیەك بوو دەستیان بیانگاتێ )) بەلام هەندێ سنووردانانیان هاتە پێش وەك ئەو جولەکانەی هاولاتی ئەو ولاتانە بوون کە دەبوایە ئەڵمانیا پەیوەندی باشیان لە گەڵ بکات، وەك ولاتانی بێلایەنی وەك سویدو ولاتانی تر کەوا هاوپەیمانی ئەڵمانیا بوون.

پاش جێبەجێ کردنی (( دوا چارەسەری بۆ کێشەی جولەکە )) لە نرویج لە ساڵی 1942دا بۆ دبلوماسیە سویدییەکان روون بۆوە کەوا رەگەزنامەی سویدی دەبێتە پاراستنی بەشێك لە جولەکە، هەروەها توانرا ئەو جولەکانەی کە سویدی نین لەم پرۆسانەدا سوود وەرگرن و بۆیان روون بۆوە ئەگەر بتوانن جولەکەکان لە دوورخستنەوە رزگار بکەن و ئەوەش بوارەکانی ژیان بۆیان گەورە دەکات.

دبلوماسیە سویدییەکان دەستیان بە دانوستانی رۆژانە کرد لە گەڵ دەستەڵاتدارانی ئەڵمانی لە نرویج و دانیمارك و هەنگاریا و ئەڵمانیا و فرنسا و بۆ ئەڵمانیەکان روون بۆوە کەوا سویدییەکان بەرژەوەندی سیاسییان هەیە لەوەی مامەڵەی چاك لە گەڵ هەندێ جولەکە بکرێت، ئەڵمانیەکان نەیانتوانی وەك خۆیان دەیانەوێت مامەڵە لە گەڵ ئەو کەسانە بکەن. سوید ئەوەی بە کار هێنا کە پێی دەگوترێت (( بەرگری بیروکراتی )) و سەلماندیان کەوا فەرمانبەرانیش دەتوانن بەرگری نازییەت بکەن. سویدییەکان لە بودابست سەرکەوتنیان بە دەست هێنا بەوەی ئیڤان دانیلسون، بارنەنجر، لارش باری و بێگومان راوول ڤالنباری پایە دبلوماسیەکانیان وەك دبلوماسی بێلایەن بە کار هێنا بۆ پارمەتیدانی 20- 30 هەزار جولەکە. هەمان ئەوە تاکتیکە لە لایەن دبلوماسیەکانی تری ولاتانی وەك سویسرا و ولاتی ڤاتیکان و ئەسپانیا لە بودابست بە کار هات.



لەم وێنەیەدا دبلوماسی سویدی راوول ڤالنباری لە پشت مێزی نوسینگەکەیدا لە بودابست دانیشتووە. بە هاتنی ئەو لە یولیو/تەمموز 1944دا پەیامنێرانی دبلوماسی وزەیەکی نوێی خەباتیان لە پێناو پارێزگاری جولەکە لە بۆدابست پەیدا کرد. دکتور ئەل بورزولت کە دایکوباوکی رەزامەندی پەیامنێرانی دبلوماسی سویدییان لە 25 مایو/ئەیار/ 1944دا وەرگرت نامەی بۆ وەزارەتی دەرەوەی نوسیبوو: (( بوارم بۆ رەخسا بۆ ئەوەی پاکترین سوپاسم ئاراستەی وەزارەتی دەرەوەی پاشایەتی و پەیامنێرانی دبلوماسی سویدی لە بودابست رابگەیەنم بۆ کارە خێراو دڵسۆزیەکانیان. پەیامی پارێزگاریکە کاری خۆی لە هەموو بارێکەوە دەگێرێت. لەم بارودۆخە کەوا هاوکاری وڵاتێکی ئەوروپاییان

هەبێ، ئەوەش ماناکەی کەمتر نیە لە هەستکردن بە زیان )). سوپای سووری سۆڤیتی ڤالنباری لە ینایر/کانوونی یەکەم گرت و نەگەرایەوە سوید و چارەنووسیش هەر بزر بوو.

(( نازییەکان تاوانبارن ، بەلام ئایا ئێمە بێ تاوانین، ئایا لەو زەمانەدا شتێ هەبوو ئەنجامی بدەین بۆ رزگار کردنی قوربانیەکان و کاری پێویست بە خێرایی بکەین. ئەگەر هەر دوو حکومەتی بریتانی و ئەمریکی بەرنامەیەکی رزگار کردنیان دەست پێکردبایە بۆ بەر جەستە کردنی ئەو پێویستیە گەورەیە، دەیانتوانی بەم کارە هەڵسن.

**جورج بیل، قەشەی تشیشستر ( ئەنکلترا) 18 مایو/ئەیار/1943.**

## تەماشاکەرەکان

ئێمرۆ مێژوونوسەکان هۆکارە مێژوویەکانی فرکردن دەکەنە سێ جۆری سەرەکی: تاوانبارەکان، قوربانیەکان و تەماشاکەران، جۆری سێیەم لە تێروانینی رەوشتەوە لە جۆرەکانی تری ئاڵۆزترە. زەحمەتە لێپرسراویەتی کەسانێك دیار بکرێت بۆ ئەو کارانەیان کە ئەوان ئەنجامیان نەدابێت یان زانیاریەك دانیان پێنەدرابێت، رەخنەگرەکان وەسفی تەماشاکەران و هەڵوێستیان کردووە و کەمتەرخەمیان بە جۆرێك لە بەشداربوونی دەزانن. بەلام ئەم جۆرە بریارانە دەبێ زۆر وریایانە دەربچێت ئەگەر ناچار کرابیت ئەوە بکەییت.

ئێمە ئەوە دەزانین ئەوانەی تەماشاکەریان ناو دەبەن لە پلەی یەکەم دیموکراسی خۆرئاواییەکانە کەوا چەندین پارانەوەیان بۆ پارمەتیدانی جولەکەیان گەیشتێ، ئایا ئەو ولات و دەستانەی کە بە تەماشاکەر ناو دەبرێن بەرپرسن لە رزگار کردنی ملیونەها جولەکەی رەگەزنامەی جیاواز؟ وەلامەکەش دوورترە لە روونکردنەوەو لە جلەکاندا چەندین دەنگی جیاواز بەرزکرایەوە.

یەکێتی سۆڤیەت بۆمانی خۆی شەڕی کرد. ئەگەر زۆریشی بۆ پارمەتی جولەکە نەکردبێ ئەوە کراوە کەوا لە کاتی شەڕەکەدا لە یەکێتی سۆڤیەتدا جوداخوازی دژ بە جولەکە لەم وڵاتەدا نەکرا. هەڵوێستی ڤاتیکان بەرامبەر نازییەکان دوو دڵ بوو، زۆر لە قەشەو راهیبەکان لە رۆژانی شەڕەکەدا منداڵانی جولەکەیان شاردەوە. کەسانیش هەبوون پاش شەڕەکە یارمەتی نازییەکانیان دا بۆ راکردنیان بەرەو ئەمریکای خواروو. هەروەها پەیامنێری پاپا لە بودابست ئەنجلو روتا یارمەتی هەزارەها جولەکەیدا. بەڵام لە سلۆڤاکیا قەشە جوزیف تیسو هەزارەها جولەکەی رەوانەی ژوورەکانی خنکاندن کرد، ئەم جۆرە هەڵسوکەوتە دژ بەیەکانە وا دەکات زەحمەتە بێ بریارە گشتیەکان بدرێت. هەڵسەنگاندنی تەماشاکەران مەسەلەیەکی لە رادەبەدەر هەستیارە.



کە هێزەکانی هاوپەیمانان لە کۆتایی شەڕەکە ئوردوگاکانی گرتن و کاریان گرت، بە دیتنی دیمەنەکان سەرسام بوون، چەندین جار فەرمانیان بە هاوڵاتیانی ناوچەکەدا کە لە رێگاکانیاندا دەهاتنە پێشیان داوایان لێدەکرد ئەو هەزارەها تەرمە بۆگەن و رزیوانە بنێژن،

لەم وێنەیەدا دیارە کەوا هاوڵاتیانی نورنبورگ ناچار کراون تەرمی گیراوەکانی ئوردوگای گرتن هەڵگرن و بە ناو شاریاندا هێنان بۆ شاردنەوەیان.

(( وا پێ دەچێ میللەت لە رایخی سێیەم زۆریان دەزانی لە (( بۆ نموونە حکومەت و کوشتنی هاوڵاتیانی نەڵمان )) یان کەمیان دەزانی لە (( بۆ نموونە حکومەت هاوڵاتیانی جولەکە )) ئەگەر ئارەزووی زانینیان هەبوو بێت. ئەوانەی نەیاندەزانی، نەیاندەویست بزانن، ئەوەش لەبەر هۆی دیاری نەزانراوە، بەڵام ئارەزووی نەبوون لە زانین، ئەوەش زانیاری تەواوە کەوا مرۆڤ هەیە نایەوێت بزانێ )). جی.بی ستیرن ، مێژوونوسێکی ئینگلیز و شاهیدێك .

(( وەکو دایك وباوکم )) هەردووکیان هەواداری حیزبی گەلی نەتەوەیی بوون لە گەڵ ئەوەدام کەوا مرۆڤ لە ژیانیدا دەتوانێ بیری دژ بە سامیەت وەرگرێ و پەسەندی بکات بە بێ ئەوەی هزرەکان کاریگەری لە پەیوەندی کەسەکە بە خەڵکانی جولەکە بکات. دەکرێ بروا بکرێت کەوا شوێنەواری لێبوردن لەم هەڵوێستەدا بەدی بکرێت. بەڵام من گوناحەکە دەخەمە ئەستۆی ئەم ناویتە بوونە چونکە بۆم دەرکەوت من هاوکاری رژێمێکی نامرۆڤایەتیم کردبوو بە بێ ئەوەی من خۆم گومانم لە پاکی و نیازی خۆم هەبێت. کە مرۆڤ دووان و پرسە بۆ ئەو هەموو ناهەمواریەی جولەکەکانی هەموو وڵاتان رادەگەێنێ، یان جولەکە بە گێرە شێوەن و خوێنیان لە رووی رەوشتەوە بەبۆگەنی بزانێ. ناچار نەکراوم بیر لەو پیاوە پیرە بەرێزە لیڤی یان روسل کوهن بکەمەوە: بەڵکو بیرم هەر لە تەرمایی مێشکی ترسناکی (( جولەکە )) کردیتەوە.

کە گوێم لێ بوو جولەکە ناچارکراون کار وماڵیان جێبهێڵن و لە گیتودا زیندانی بکرێن. لە ناکاو ئەوەم لە مێشکدا چەسپا و ئەوەم لە هزردا گەڵاڵە نەبوو کەوا ئێوە ئەوە چارەنووستان دەبێت تۆ پیرە مێردەکە لیڤی. تەنیا جولەکە بوو راونران و بوکانەوە )).

ملیتان ماشمان، سەرکردە لە بوند دوتیر مدل، لقی کیژان ( 18 ـ 14 ) ساڵان لە کەتائیبی هتلر.

# شاهیدەکانی کۆمەڵکوژییەکان

هەر لە رۆژی یەکەمی داگیرکردنی پۆلونیا لە لایەن ئەڵمانیاوە، توندوتیژی و درندایەتی بووە زیانی رۆژانە. ئەو زیانەی بەر گەلی پۆلونیا - جولەکە و ناجولەکە گەلێك زۆر بوو، تا ئیمرۆش وڵاتەکە لە ژێریا دەناڵێنێ، پۆلونیایەکان ناچار کرابوون نەك هەر شاهیدی قڕکردنەکە بن بەڵکو لە گۆرەپانەکەی خۆیان لە گەڵیاندا بژین، ژمارەیەکی کەمی پۆلونیایەکان هاوکاری نازییەکان بوون ، هاوکاتیش ئاسایی بوو کەوا پۆلونیەك زمان لە جولەکەیەکی هەڵاتوو بدات و یان بە پارە بیانشارێتەوە و دوایش خیانەتیان دەرحەق بکات، لە لایەکیترەوە هەزارەها پۆلونی خۆیان و خێزانەکانیان توشی مەترسی زۆر کرد کە یارمەتی جیرانە جولەکەکانیان دەدا. هەر تەنیا پۆلونیایەکان بوون کەوا بزافی بەرگریان بە نیازی رزگارکردنی جولەکە دامەزراند.

پێش شەڕەکە پەیوەندی نێوان پۆلونیایەکان و جولەکە ئاڵۆز بوو و سیمای بێ باوەری و دژایەتی لە هەر دوولاوە بەدی دەکرا، سەرەرای ئەوانەش ئەیاری سامیەکان هەبوون یارمەتی جولەکەیاندا، ئەوەش لە بەر هۆیە ئاینیەکان یان لە بەر هاوسێیەتی بوو. بێجگە لە جولەکە و قەرەج هیچ کۆمەڵێکیتر وەك پۆلونیایەکان تووشی دەردەسەری نەهاتن. هەردوو لایەك دوژمنی هاوبەشیان هەبوو و بەرژەوەندیان لە یەك نزیك بوو.

( لە کۆی سێ ملیون جولەکە لە پۆلونیا 300 هەزاریان ) رزگاریان بوو، کە گەرانەوە هیچ یارمەتیان نەدراو بە ساردیش پێشوازی کران و بەچاوی دژمنداریش تەماشا کران. راویان نرایەوە و دەست درێژیان کرایە سەر و دووبارە زۆریان رایان کردەوە. بەڵام ئیمرۆ زۆر لە گەنجانی پۆلونی هەمن بایەخ بە مێژووی جولەکەی وڵاتەکە دەدەن، لە پەرستگا جۆڵەکان و گۆرستانە بە تاڵەکان، بەڵام جولەکەکان بزر بوون.

کامبودی فیوریم بە بیر دێتەوە، لە ئێوارەیەکی جوانی بەهاردا.
لە گەڵ ئاوازی مۆسیقای زیندوو لە وارشۆ لە لای چەرخوفەلەکە هەواییەکە.
مۆسیقای شلاگر دەنگی لێزمەی تەقەی پشت شورەکانی گیتوی پڕ کردبوو.
جوت سوارەکان بۆ ئاسمانی بێگەرد بەرز دەبوونەوە.
لە خانووی سوتاوەکاندا باهۆز جار ناجارێ حەزیای رەش هەڵدەگرێت.
خەڵکیش لە چەرخ و فەلەکی هەواوە ئالاکان دەگرنەوە
باهۆزە هەڵکردووەکە لە ماڵە سوتاوەکان تەنوورەی کیژۆڵەکان هەڵدەدانەوە.
تریقەی پێکەنینی خەڵکەکە و زەوقیان لە رۆژی شەممەی جوانی وارشۆدا
کەسانێ هەن لە وارشۆ و رۆمادا رەوشت وەردەگرن
بازار دەکەن، گوێ دەگرن، خۆشەویستی دەکەن
بێ ئەوەی هۆشیان لە سوتانگەکانی شەهیدان بێ
یەکێکیتر رەنگە رەوشت وەرگرێت
ئەوەی مرۆڤایەتی بێ دیار نیە
لە بیر چوونەوە قول دەبێتەوە و گەشە دەکات
گەرچی ئاگرەکان هێشتا دانەمرکاون
بەڵام ئەمجارە بیرم لە یەکێتی ئەو مردووانە کردەوە.
لە کامبودی فیوری، تشیسلاڤ میلوش
(( نیلس ئوکە نیلسون کردیویەتی سویدی ))

سیسلیا برزیلوکا خوێندکاری پۆلەکە بوو وا باسی هاورێیە جولەکەکانی خوێندنگای و چارەنووسیان دەکات:
(( ئەگەر بە ئاوێنەیەکی گەورەکەر سەیری ئەم وێنەیە بکەین دیارە کەوا پۆلی پێنجەمی ئا لە شاری کوزڤو مـن بودولینە، دیاریشە کەوا بە بۆنەی نزیکبوونەوەی پشوی هاوین دڵشادن.
کە چوومە بەر خوێندن باوکم ئامۆژگاریکردم کەوا لە تەنیشت خوێندکاری جولەکە دانیشم و بەردەوام دەیووت: (( جولەکە خەڵکی زیرەکن ـ دەبێ مرۆڤ گوێیان لێ راگرێت )). بۆیە من هاورێیەکی نزیکیان بووم، بە تایبەتی لە گەڵ

روزا و کلارا. هەردووکیان لە ناوەندی پۆلەکە دادەنیشتین، روزا زۆر وریا بوو، پرچی دەکردە بسکو کەزی و بە لوولدراوی درێژی دەکردن و دوو گوڵی لە نزیک گوێیەکانی دادەنا. لە زمێریاریدا زیرەکترین کەس بوو و لە زمێریاری یارمەتی ئەوانی تری دەدا.
کە چووینە گەشتێك بۆ هەموو خوێندکارەکان نانی فرنسی هێنابوو، دایکوباوکی نانەواخانەیان هەبوو، کلارا لە تەنیشتی دادەنیشت و لە یەکتری جیا نەدەبوونەوە. کلارا پرچە لوولە چرەکەی دەکردە بسك. دڵشاد دەبوو کە بە توانجەکانی پێدەکەنین، ناسك و زیرەك بوو، لە وێنەکەدا دیارە لە تەنیشت دیوارا وەستاوە. لە تەنیشتی موشیو بە یاخەیەکی سپی دووقاتەوە راوەستاوە وە هەر کراسی وای لە بەر دەرکرد، سەری لە ناو لەپی دەستەکانی دەناو بیری دەکردەوە.
لەو کاتانەدا مامۆستاکە دەیووت: (( موشیو ، دڵنیام تۆ وەڵامەکە دەزانی ))
بێگومان وەڵامەکەی دەزانی، سونیا لە لای چەپی پشتەوە دیارە ، تەنیا کیژۆڵەیە، رێكوپێك و ئەندام جوانە، بە سەماو گۆرانیەوە بۆ وانەکان دەچوو، لە دوای ئەوەوە سارا (( لێرە لە لای چەپەوە )) دێ پرچی رەنگ مسی سوورە، شەرمن بوو و لە گەڵ زمانی پۆلونی کێشەی هەبوو.
کیژ و کوڕێکیش هەبوون ناوەکانم لە بیر نەماون (....).
کە ئەڵمانیەکان هاتن هەموو منداڵە جولەکەکانی ئەم وێنەیان کوشت و هەروەها ئەوانەی لە خوێندنگاکەش بوون - دایكوباوك و خوشك و برا و خزمەکانیانیشیان. ئەڵمانیەکان هەموویان بردنە کانی بەردەکە و گوللە بارانیان کردن، بەم شێوەیە سێ بەشی هاوڵاتیانی شارەکە مردن. تەنیا چوار کەس رزگاریان بوو، شموك و دەستگیرانەکەی کە دایکم لە ژێر زەمینەکەی شاردنەوە و ساڵێك و نیو نانی دانێ و باوکیشم بەوەی نەدەزانیو رووداوەکانیان لەم ژێر زەمینە بەرێ کرد و کوڕێکیان بە مردوویی بوو و لە تەنیشت خۆیان شاردیانەوە و ئێمەش هەتا رزگاربوونیان نەمانزانی )).

## دیموکراسیەکان دەرگاکانیان دادەخست

ئەو راونانە درندانەیەی ئەڵمانی نازیی دەرحەق بە جولەکەی دەکرد بە شێوای دەگمیشتە ئەورووپای خۆرئاوا، نەریتە مرۆڤایەتیەکان و پەیدا بوونی هێزی دژایەتی سامیەت دژ بە یەك رووبەروو بوونەوە. زۆر کەس هیوادار بوون یارمەتی پێشکەش بە زیان لێکەوتووەکان بکەن، بەلام ترس وای لێکردن دەرگاکانی یارمەتی بە رووی هەزارەها جولەکەی راکردوو دابخەن. کەم لە سیاستمداران وێران بەرهەڵستی ئەو بریارانە بکەن کەوا لە مێژە رەگیان داکوتاوە، چەندین دەنگ بۆ کۆمەڵی جولەکەی ئەڵمانیەکان بەرز کرایەوە، سیجفرید هانسون بەرێوەبەری بەرێوەبردنی کاروباری کۆمەلایەتی دانیبەوە نا: (( نەماندەتوانی لە سینگمان بدەین و بڵێین ، ئێمە یارمەتی پەناهەندەکانمان داوە بە شێوەیەك پاڵپشتی باوەشەکراوەکان کراوە، ئەوەندە بەخشندەش نوبووینە بەدانانی مۆڵەتی نیشتەجێی بۆ ئەو بێگانانە کەوا لە ترسی راونان و رەشەکوژی دەهاتن )).

لە پایزی 1942زانیاری زۆر لە سەر کۆمەڵکوژی هەبوو و پاڵەپەستۆ زۆر لە سەر هاوپەیمانەکان هەبوو بۆ ئەوەی کاری بکەن، بەلام کاری بەرامبەر ئەوە وەك نەبوون وابوو.

دوایی حکومەتی ئەمریکا رێکخراوێکیان بۆ یارمەتیدانی جولەکە دانا بە ناوی (( چڤاتی پەناهەندانی شەڕ War Refugee Board ))، حکومەتی بریتانیا دژ بوو و چڤاتەکە بە یاریەکی پروپاگەندەیی ناوبرد. سەرەرای ئەوەی ئەم رێکخراوە چەندین دەستکەوتی گەورەی هەبوو ئینجا هەندێ مێژوونوسان سیاسیەتی ئەمریکایان بەوە پێناسە کرد کەوا (( نسکۆیەکی گەورەبوو بۆ سەرۆك روزفلت )) ئەوانەی داکۆکیان لە روزفلت دەکرد دەیانووت باشترین کۆمەك بۆ جولەکە ئەوەیە بە زووترین کات شەڕەکە تەواو بێ، ئەوەیان هەتا رادەیەك راست بوو، چەندین توژینەوەر دەیانەوێ رەخنە لەوە بگرن کە زۆرجار دەوترێت (( شکستی دیموکراسیەکان )).

# گەران بە دوای شوێنێك بۆ پەناهەندەیی

پەناهەندەی جولەکەن لە پاپۆری ئەس ئەس سانت لویس پاش ئەوەی ناچارکران بگەرێنەوە ئەوروپا. لە 13/مایو/ئەیاری 1939 نزیکەی هەزار پەناهەندەی جولەکە لە هامبۆرگ سواری پاپۆری ئەڵمانی ئەس ئەس سانت لویس بوون بەنیازی راکردن لە دەست نازییەکان، مەبەستیان کوبا بوو بەڵام بوار نەدرا دابەزن. کۆششیان دۆزینەوەی شوێنێك بوو بۆ پەناهەندەییان لە ئەمریکا. پاش مانگێك دەبوایە برۆن بەرەو ئنتفیربن لە بلجیکا. لە 17ی یونیو/حوزیران گەیشتنێ، سەرەرای ئەوەی هەندێکیان وارێکیان لە ئەنگلترا دەست دەکەوت، بەڵام لە دواییدا زۆریان کەوتنە دەست نازییەکان و رەوانەی ئوردوگاکانی قڕکردن کران.

ئیشمان راگرت و سەرباز و مەدەنیەکانی ئەڵمانی بەرە و حەشارگەکان رایانکرد، ئێمە زۆرمان وامان نەکرد، رەنگە هەستمان بە سەرکەوتن و هەندێ تۆڵە کرد. هیچمان نەبوو لەکیسمان بچێ، تەنیا چاوەرێی ئەوە بووین ئەو کارگە زەبەلاحە بروخێنین کە بۆ دامەزراوی ئەی جی فارین ئەندوستریمان دروستمان دەرکرد. کە ئەمریکاکان دەستی بە بۆمبابارانی راستەقینەکرد نەدەتوانرا هەستکردن بە دڵشادیمان بشارینەوە.

ئێمەش ژیانمان لێکەوت - کوژراوو برینددار. جوان بوو کە بینیمان رەوە فرۆکەکان یەك لە دوای یەکدا لە ئاسمانا دەردەکەوتن، بۆمباکانیان بە تاڵ دەکرد، دروستکراوەکانیان دەرووخاند، هەتا ئەوانەی دەکوشت کە لە گەڵ میللەتی دەستەڵاتدار بوون، ئەوەی جێگای سەیرە کەوا پرۆسەکانی بۆمبابارانەکە ورەی بەرز دەکردینەوە. هیوامان زیندوو بۆوە بۆ رزگار بوون و هەڵاتن لەو دۆزەخەدا. بۆچوونەکان دوور دەرۆیشتن و بوونی پەیوەندی هاوبەشمان لە نێوان هاوپەیمانان و ئەو برالە نهێنیە بچوکەی ناو ئوردوگاکە هەست پێکرا، ویستمان لە نێوان رووخان و هەڵاتندا ریز کردنی هاوبەش بدۆزینەوە، رووخانەکەی کە لە ئاسمانەوە بە فرۆکە بۆمبا هاوێژەکان و مردنمان، ئێمە کە رامان کرد. هەتا

ئەگەر ناچاریش کرابایین بکرێینە مرۆڤی بە بۆمبا چێنراو ، بە داخەوە ئەوانە هەموو رووی نەدا.

شالوم لیندنباوم، یەکێکە لەوانەی لە ئوشفیتز ـ مونوفیتز بوو و لە ژیاندا ماوە.

## بۆمباباران کردنی ئوشفیتز

لە بەر چاوی هەموو جیهاندا لە مایو/ئەیار 1944دا پرۆسەی دوورخستنەوەی جولەکە لە هەنگاریاوە لە رێگای سلۆڤاکیا بۆ ئوشفیتز ئەنجام درا. چەندین رێکخراو و کەسایەتی لە حکومەتی ئەمریکی و بەریتانی پارانەوە شتێ بکەن بۆ راگرتنی ئەم رۆیشتنە. داواش کرا بە تایبەتی بۆمبابارانی ئوردوگای قڕکردنی ئاوبانگ خراپی ئەو کات بیرکناو بکریت یان هێڵەکانی ئاسنی شەمەندەفەرەکان خاپوور بکرێت.

دوا ساڵی شەڕەکە بوو، هاوپەیمانەکان کۆنترۆڵی بواری ئاسمانی ئەوروپایان کردبوو، فڕۆکە ئەمریکیەکان لە ئیتالیا هەڵدەستان و لە نزیك ئەو ناوچەیەدا و لە ئوردوگاکەدا دەفرین، بەڵام لە بەر چەند هۆ هاوپەیمانەکان گوێیان نەدایە ئەو داوایە بێ هیوایانە. هەندێ لە هۆیەکانی لایەنە رەسمیەکان شەرمەزاری دەبەخشێ. وەزیری بەریتانی ریتشاردلو وەڵامی سەرکردەی جولەکە حایم وایزمانی لە سیپتمبر/ ئەیلول 1944 دا داوەتەوە: (( سەرکردایەتی هێزی ئاسمانی زۆر وردبینانە شرۆڤەی کردووە، بەداخەوە پێت رادەگەیێنم کەوا لە بەر تەنگژە تەکتیکیە زۆرەکان لەم زەروفانەدا هیچ بژاری ترمان نیە بێجگە لەوەی داواکەت رەت بکەینەوە. هەندێ لە مێژوونوسەکان وا دەزانن دژایەتیکردنی سامیەت دەوری هەبووە، تا ئیمرۆش ناکۆکی هەر هەیە: سوودیان لەم هەلە وەرنەگرت بۆ رزگار کردنی ئەو جولەکانەی لە رێگاوە بوون بۆ ژوورەکانی گاز.

# پەندەکان

نوسەری فرنسی خاتوو شارلوت دلبو گیراوێکی سیاسی بووە لە ئوشفیتز . بیرکناو باس لە بناغە بێبنەکە دەکات کە لەجیهانی ئوردوگای نازیەکان دۆزرایەوە، نوسەرەکە وای لێکردبین کەوا بێ چاو قوچاندن چاودێری ئەم جیهانە بکەین و هەوڵ بدەین (( کە تێبگەین )) لە هەمان کاتدا ئەو زانینەی ئەو پێشکەشی کردین شارەزایەکانی (( بێ سوود )) بوون.

هۆڤیانەی فرکردنەکە توندرەویی دادەمەزرێنێ دژ بە دەست خستنی پەندەکان.

ئەو وێرانەی لە کاتی شەڕی جیهانی دووەم رووی‌دا تا ئێستاش لە دەرەوەی چوارچێوەی توانامانە بۆ تێگەیشتن، بۆ شەڕەکە دوو هۆکار هەبوون ، لە لایەك شەڕەکە سیاسی (( لاسایی )) بوو، ملیونەها کەس گیانی لە دەستدا. بەڵام هۆکاری دووەم جیاوازە، شتێکی تازە بوو ، شەرێکی ئایدلۆژی بوو بە شێوەی سەرەکی دژ بە جولەکە بوو و ئامانجەکەشی سرینەوەی بایولوژیای بوون بوو لە ئەوروپادا. جولەکە لە ئەوروپا دوارۆژیان هەبوو ئەوەش پرسیارێکە بە کراوەیی دەمێنێتەوە بەڵام لەوە دڵنیاین کەوا کاری وا لە مێژوو و گەشەی ئەوروپا بە شێوەیەکی خراپ کرد.

ئێمە زۆر لە سەر کۆمەڵکوژی جولەکە دەزانین، (( چۆن )) ئەوەیان ماوەیەکی زۆر پرسیارێکی گرنگ بوو بۆ توژینەرەوانان، بەڵام پرسیاری (( بۆ )) . بۆ نموونە 90٪ منداڵانی تەمەن لە ژێر 15 ساڵیدا لە ئەوروپا دەبێ بمرن. ئەوەش ئیمرۆ گرنگە وەك چۆن ئەو کات بۆ قوربانیەکانیش گرنگ بوو. زۆر رۆشنفکرەکان بانگێشەی ئەوە دەکەن کەوا هەرگیز تێناگەن (( بۆ )) . تێگەیشتنی دوارۆژی تەواو بۆ فرکردنەکە دەکەوێتە دەرەوەی چوارچێوەی توانینی تێگەیشتنی مرۆڤایەتی.

بەڵام نکۆڵیکردنی پشتاوپشتی پاش فرکردنەکە یان بایەخ پێ نەدانی مەترسی گەورەیە بۆ دوارۆژی هاوبەشمان. بەڵام نوسەر بریمولیڤی دەڵێ: (( ئەوەندە ئاسان و خۆش نیە ئەم بناغەیە بەدکاریە هەڵدەینەوە (....) وا لە مرۆڤ دەکرێت بە ژانەوە تەماشای دوور بکرێت و نەکرێ ببینن و ببیسن: دەبێتە شەیدایی بۆ

مـرۆڤ هـەتا بـەرگری بکـات )). (( مـرۆڤ هیـوادار بـوو کـەوا مەسـەلەکە رووی نەدابایە، شتەکە تاریك و ناشیرینە، بەڵام لـەو کاتـەوە کە فڕکردنەکـە رووی داوە تا ئیمڕۆش دەبێتە بەشێك لە میراتی ئەوروپا )).

بە بۆچـوونی مێژوونوسی عومـەر بـارتوق، ئـەوەیان کـارێکی زۆر ترسـناکە (( کە نەتوانرێت هیچ شتێ لە فڕکردن فێربین )). فڕکردن (( سەرجەم ناواخنـەکـەی و هـەموو بۆشـایەکان، جـارێکیتر بێمانایـە )). دەرئـەنجام هـەموو پرسـیارەکان لـە دەوری دەسوورێنەوە کەوا پەنـدەکان هیچە. ئـەوە بۆچـوونێکی بـەهێزە، فڕکردن ئەو کونە رەشەیە لە مێژووی جیهانی هاوچەرخ و مێژووی ئـەوروپا. فڕکـردن لـە بەر ئەوە رووی‌دا چونکە کەسانی وەك من و تۆ نەخشەی کۆمەڵکوژییان داتاشیوە و بـە چـەند ساڵی بەردەوام جێبەجێیان کـرد. دەتـوانـرا بـژاریتر بدۆزرێتـەوە و دەیانتوانی ئەوە نەکەن.

بەرپرسـیەتی هـەر دەکەوێتـە سـەر ئەسـتۆی باوکـەکان، مامۆسـتایەکان ، سیاسـتمداران و هـەموو ئـەو گەورانـەی منـاڵان فێـر دەکـەن و ئـەوانیش لـە لایـەن خۆیانەوە مناڵان فێرکەن، بـژاری چـاك هەیـە . بـەڵام تـەنیا ئەگـەر مـرۆڤ بینـی و زانی کەوا بژاری خراپ بەرەو کێندەری دەڕوات.

(( لە بەر ژمارە ترسناکەکانی قوربانیەکان ئەو تاوانانە بێ وێنەن، مەترسیدارتر ئەوەیە کەوا ژمارەیەکی زۆر لە کەسەکان پەکیان گرتووە بۆ ئەنجامدانی. (....) بەربەرەکانێیان کردووە لە سەر توندکاری و تاوان )).

روبرت ئەتش جاکسون ، دادوەر لە دادگاکانی نورنبیرگ.

ئای، ئەوانە کەی دەزانن

دەزانن کەوا برسیەتی پرشنگ لە چاوان دروست دەکـات و تێنویـەتیش تـاریکتری دەکات

ئای، ئەوانەکە دەزانن

دەزانن مرۆڤ هەیە دەتوانێ ببینێ دایکی دەمرێ و گریانی نەیێت.

ئـای، ئەوانـەی کـە دەزانـن، دەزانـن کـەوا مـرۆڤ بـەیانیان پەرۆشـە بـۆ مـردن و ئێوارانیش لێی دەترسێت.

ئای، ئەوانەی کە دەزانن

دەزانن رۆژێك لە ساڵێك درێژترە و چركەیەك لە ژیان درێژترە
ئای ئەوانەی كە دەزانن قاچ لە چاو ناسكترە و دەمارێك لە قاچ بە هێزترە و دڵ لە پۆلا رەقترە.
(.......)
دەزانن، ئازار دوایی نیە و تۆقاندن بێ سنوورە، ئەوە دەزانن
ئێوە ئەوە دەزانن

شارلوت دلبو
(( ئیڤا نوكربیرك وەریگێراوەتە سەر زمانی سویدی )).

# بەسەرهاتە زیندووەكان
# بەشداریكردنی راگەیاندنە لە سەر قڕكردن.

لە دانوستانی سەرۆك حیزبەكان لە یونیو/حوزیرانی 1997دا یوران پیرشۆن سەرۆكی حكومەت پێشنیاری كرد كەوا كارێكی راگەیاندنی بەر فراوان لە سەر قڕكردن بكرێت بە ناوی بەسەرهاتە زیندووەكان ، مەبەستیش ئەوە بوو قڕكردن لە كاتی شەڕی دووەمی جیهان بكرێتە خاڵێكی وەرچەرخان بۆ بابەتی هاوكاری مرۆڤایەتی و دیموكراسیەت و یەكسانی لە نێوان هەموو خەڵكدا. لە بەر رۆشنایی زانیاری و گفتوگۆ ئیش بۆ دژایەتی دووبارە كردنەوەی ئەمە بكرێت. پێویستە قڕكردن زەنگی هوشیاركردنەوە بێت كەوا بەردەوام لێبدات تا هوشیار بین ئەوەك رووبدات ئەگەر بەردەوام نەبین لە سەر گفتوگۆ لە سەر دیموكراسی و بەها مرۆڤایەتیەكان.

دەستپێشخەرەكەی بەسەرهاتە زیندووەكان لە سێ بەش پێكهاتووە:
. چەلاكی كردن بۆ دەرخستنی هەڵوێستی سیاسی هاوبەش لەمەڕ حاشاكردن لەو هێزانەی قڕكردن رەت دەكەنەوە و پاڵپشتی ئەو ئایدلۆژیانەش دەكەن كە دوای كوشتنی بە كۆمەڵن.

ـ زانیاری بۆ دایكوباوكان و هاوڵاتیان و دانانی لاپەرەیەك لە سەر (( تۆری ئەنترنێت )) بۆ زانیاری كۆ كردنەوە لە سەر قڕكردن، ناونیشانی ئەم لاپەرەیەش بەم جۆرەیە WWW.levandehistoria.org

. هاوبەشكردنی راگەیاندنی ئاراستە كراو بۆ خوێنندگاكان وەك فلیم. رێكخستنی كۆر بۆ مامۆستایان و كردنەوەی مەڵبەندی راهێنانی نیشتمانی بۆ توژینەوە و فێربوون لە سەر قڕكردن و كۆمەڵكوژی لە زانكۆی ئوپسالا.

هاوهەڵوێستی حیزبەكانی ناو پەرلەمان

قڕكردن یەكێكە لە درندەترین تاوان كە دەرحەق بە مرۆڤایەتی كراوە، نازییەكان ملیونەها مرۆڤیان كوشت، ئیمرۆ وا دەردەكەوێ كەوا ئەم تاوانانە ئەگونجاو بوون، گەرچی تەنیا هەر پەنجا ساڵ بەسەر ئەنجامدانی تێپەرییوە.

ئێمەی كە هەموویان دەخوازین لە كۆمەڵگایەكی پەیوەست بە بەهاكانی مرۆڤایەتی و دیموكراسی و دابینكردنی مافەكانی هەموو لایەك بژیین و رووبەرووی ئایدلۆژیای توندرەوی بەوەستین. ئاگری دەستەوەستان بەوەستین و ببینین كەوا هزری نازییەت وا گەشە دەكات و چۆن دەتوانین نكۆڵی لە تاوانەكانیان بكەین. ئەوەی مێژووی لە بیر دەچێتەوە مەترسی بۆ دووبارەبوونەوەی دەكات. ئەوانەی تاوانەكانی نازییەكانیان بینیوە لە ژیاندا ماون. پێویستە بە مردنیان راستی رووداوەكانی پێش پەنجا ساڵ نەمرێت. پێویستە ئازارەكانیان لە بیر نەچێت. ئەركمان ئەوەیە كەوا كۆشش بكەین ئەمە دووبارە نەبێتەوە.

لەبەر رۆشنایی ئەم بناغەیەدا حكومەت دەستپێشخەری (( بەسەرهاتە زیندووەكان )) ئەنجام درا. ئەمەش خۆپیشاندانێكی گەورەیە بۆ زۆر كردنی زانیاری خەڵك لە سەر قڕكردن.

بەشداری كردنەكە گەورە بوو، ئیشە گرنگەكەش ئەوە بوو راوەستانی حیزبەكانی ناو پەرلەمان هاوشانی یەك و لە پشت دەست پێشخەری (( بەسەرهاتە زیندووەكان )). من وەك سەرۆكی حكومەتی سوید سەربەرزم بەوەی هەڤاڵبەندین لە خەباتا دژ بە نازییەت و لە پێناوی بەهاكانی مرۆڤایەتی.

یوران پیرشۆن ـ پارتی سۆشیالیستی دیموكراس.

بێـدەنگ بەرامبــەر فرنــەكانی ســوتاندنی ئوردوگاكــانی قڕكردنــی نازییــەكان راوەستام. لە لای گۆڕە كراوە بە كۆمەڵەكان پاش سەر بڕینەكانی درندانەی شەڕی بۆسنە راوەستام. پێناسە كردنی كاریگەریـەكانی قڕكردنـی بـە كۆمـەڵی سەردەمی ستالینم خوێنـدەوە. رەنگـە ئەوانـە دووبـارە ببنـەوە ، هیتلـەرێكی نـوێ مـەرج و پێویست نیە، یان ستالینێكی تر پەیدا بێتـەوە. بـەڵام ترسـان لـە بێگانـە دەبێتـە هۆی یـەكتری نـەبوردن، یـان رق مـەزن بكرێـت و لـە خـەڵكا بوورژێنێـت، ئینجـا بازنـەی كوشـتن پەیـدا دەبێتـەوە و فـراوان دەبێـت، كوشـتنی ئەوانـەی ناكاریـان جیاوازە، یان ئەوانەی بۆچوونیان جیاوازە، یان ئەوانەی بڕوای ئایینیتریان هەیە. جولەكە، یان سپی، یان رەش و خەڵكیتر. كوشتنی خـەڵكیتر بـەس لەبەر ئـەوەی جیاوازن لە تۆ.

بۆیە زۆر گرنگە لە مێژوو فێرببین ، پێویستە هەرگیز لە بیر نەكەین و پێویستە پەنـدی لێوەرگرین. ئـەوەی لـە زۆر رەوشـا وەك كـەس و میللـەت و شارسـتانی جیامان دەكاتەوە هەر ئـەوەش گەشەبوونمان دەوڵەمەنـد دەكات و وزەی دەداتـێ. كـاری هاوبەشـی تونـد لـە نێـوان كەسـەكان و میللـەتان و حكومـەتان دەبێتـە بەربەستی هێمن لە رووی درندایەتی بۆ كوشتارێكی تازە.

كارل بلت . پارتی پارێزگاران.

هەموو كەس تایبەتمەندی خۆی هەیـە و لـە بەر جۆری دیـای دەبـێ بـەرێزەوە پێشوازی لێبكرێت. بنچینەكانی كۆمەڵگای دیموكراسی ئەوەیە كەوا دەبێ كراوە و سینگ فراوان بێ بەرامبـەر كەسانیتر بـێ گوێدانی ئـایین و رەگەز و رۆشـنبیری یان ناسنامەی رەگەزەكەی. بەڵام ئەو پێوانەیـە هـەتا هەتایـە چەسپاو نیـە. بۆیـە دەبێ هەموو ئەوەیەك بۆ سەركەوتن و بە دەست هێنانی راستیەكانی مرۆڤایـەتی و دیموكراسیەت بچێتە پێش. بۆیـە رێزگـرتن و سـینگ فراوانـی بابـەتی دارشـتنی یاساكان نین و یان چارەسەری بەرێوەبردن نین. ئـەو پێوانانـەی كـە دەمانـەوێت كۆمـەڵگای لـە سـەر دامـەزرێنین دەبـێ لـە ناخـەوە هـەڵقوڵاو بێـت بـۆ رێزگرتنـی هـەموو كەسـێك. لاسـاری دژ بـە كـەس لاسـاییە دژ بــە بناغـەكانی كۆمـەڵگای دیموكراسی مرۆڤایەتی. هەموو پێوانەكانی مرۆڤایەتی و بەهاكانی كەسـایەتی بـە یـەكجاری لـە سـەردەمی هتلـر و قڕكردنــدا ورد و خـاش كرابـوو، دەبـێ ئەمانـە

دووبـاره نەبێتـەوە، ئەوەشـە کـە ئێمـەی قـەرزاری ئەوانـە کـردووە کـە ژیانیـان لێکەوتووە، دەبێ هەموو کەسێك بـە چاوی ئادەمیزادی یەکسان تەماشا بکرێت، ئەوەیە کە ئێمە خۆمان بە قەرزاری دەزانین.

ئولوف یوهانسون / حیزبی ناوەند

(( بۆیە جارێکیتر )) دەڵێین، ئێمـە بەرامبـەر تاوانـەکانی نازییـەکان پەشۆکاوین، ئینجـا جـارێکیتر و جـارێکیتریش پرۆسـەکانی قڕکـردن، ئوردوگاکـانی گـرتن، کۆمەڵکوژی روو نەداتـەوە، ئەوانـە دواجـار لـە بۆسنە و روانـدا روویدا. سـەرەرای ئـەوەی ماوەیـەکی زۆر بـە سـەر لـە ناوچـوونی نازییـەت گـوزەری کـردووە، بـەڵام هێـشتا درندایـەتی دەرحـەق بـە جیـاوازی بۆچـوون لـە بیرکردنـەوە لـە لایـەن حکومەتـە دکتاتۆرەکـان پـەیرەو دەکرێـت ؛ بۆیـە دەبـێ هـەر بڵێینـەوە (( نـا بـۆ دووبارە بوونەوەیان )) پێش هـەموو شـتێك دەبـێ بـەم گیانـە کار بکـەین، ئەگـەر درندایـەتیمان وەرگـرت وەك کـارێکی ئاسـایی ئـەوە ئێمـە وازمـان لـە خـەبات لـە پێناوی مرۆڤایەتی و پێوانە مرۆڤایەتییەکان هێناوە.

زانـین بناغـەیە و بەشێکی زانینـی پێویست تایبەتـە بـە دژایـەتیکردنی سامیەت. مێژووەکەی، خەسڵەتەکانی و جیهانـە نەخۆشـەکەی ، سـەرەرای ئـەوەش دەبینـین پـارێزەرێکی سـویدی دووانـی ئـەوە دەدات کـە بۆچـی سـڵاوکردن وەك هتلـر کردەوەیـەکی دوژمنداریـە. ( لـە ینـایر/ کـانوونی دووەمـی 1998 ). بەشـی زۆری مۆسـیقای سـپی دەسـتەڵات کـە ئیمـرۆ لـە جیهانـدا دەفرۆشـرێت سەرچـاوەیەکی سـویدە. لـە لای مـن ئـەو دوو نموونەیـە بەسـە بـۆ ئـەوەی بڵێم (( بەسـەرهاتە زیندووەکان )) کاریگەری گرنگی دەبێت.

لارش لیونبورگ حیزبی گەلی لیبراڵ.

بـۆ ئیمـرۆ کـارێکی زێـدە گرنگـە قڕکـردن بـەبیر بهێنینـەوە، هـەر لەبـەر ئـەوە ناکەسانێ هەن نکۆڵی لە رووداني قڕکردن دەکەنـەوە، بـەڵکو لەبەر ئـەوەش کە گەشەی کۆمەڵایەتی لـە ئـەورووپای ئیمـرۆ ئـەوە نیـشان دەدا کـە هەنـدێ لێکچوون هەیە لە گەڵ ئەو کاتانەی پێشی وەرگرتنی نازییەکان دەستەڵات لە ئەڵمانیادا.

مرۆڤایـەتی لـە کـاتی شـەڕی دووەمـی جیهانیـدا قوربـانی گرانـی پاشـان زانـی و فێربوو کەوا تەنگژە ئابوورییەکان، زۆر بوونی بێکاری و بێ ئاسایشی کۆمەڵایەتی

وەك رابــردوو هێــزە نادیموكراسـیـەكان جیـاوازی رۆشـنبیری و رەگـەزی دەبیـنـن، خۆیان بە ئایدلۆژیای رەگەزپەرستی چەكدار دەكەن و لە قوربانیـەك دەگەڕێن، ئـەوەش بـۆ ئەوەیـە تـا هـەموو كەموكوریـەكانی كـە هاتوونەتـە پـێش ڕەوشـە كۆمەڵایەتیـە خراپـەكانیان بخەنـە ئەسـتۆی كـە لـە ئـەنجامی نایەكـسانی و ناراستیەكان پەیدا بوون.

بێگومـان پەخـشی زانیـاری و زانیـاری دژ بـە نازییـەت و رەگەزپەرسـتی كـارێكی پێویـستە، بـەڵام دەبـێ هاوشـان بـێ بـە كـردەوەی بـەهێز و دژ بـە بێكـاری و جیاكردنەوەی ناوچەنشینەجێیەكان و رەوشە كۆمەڵایەتیە خراپەكانیتر.

گودرون شیمان/ حیزبی چەپ

ئێمە دەڵێین نازانین ئەوە چۆن ڕوویدا، مێژووەكـەمان و ئـەو كارەساتانەی پـێش پەنجا ساڵ لە ئەوروپا ڕوویدا ، فێركردن، ڕوویدا چونكە كەسانی وەك مـن و وەك تۆ بەرگرییمان لەبەر جیاوازی لە مافی مرۆڤ نەكرد. بەرگرییمان لە مافی ئـازادی جیاوازی لە بۆچوون و بڕوا نەكرد. بـەرگری نـەكرا لـە مـافی ئـازادی جیـاوازی لـە بۆچوون و بڕوا. ئاوێتە نەبوون دژ بە رەگەز پەرستی و دژایەتی بێگانە لـە كـاتی پێویستدا. پێویستە ئەم كارە دووبارە نەبێتەوە، تێگەیشتنی بەهاكانی مرۆڤایـەتی بـۆ هـەموو مرۆڤێـك پێویـستی هاوبەشـە، كـارێكی زۆر بایەخـدارە، تێگەیـشتنی هاوكاری هاوبەشانە لە گەڵ ئـەوەكانی داهـاتوو كـارێكی بنچینەیی و پێویـستە بـۆ كۆمــەڵگای دیموكراســی. پێویــستە هــەمووومان بەرپرســیایەتی دامەزرانــدنی كۆمەڵگایەكمان لە سەر شـانە كـەوا جێگـای هەمووومانی لێببێتـەوە، كۆمەڵگایـەك هەموو هەست بكـەن هاوبەشـن و هەست بكـەن كـەوا دەتـوانن كاریگـەریان هـەبێ، كۆمەڵگایەك دیموكراسی و ئاسایش بپارێزێت.

ماریان سامویلسن، پارتی ژینگەی سەوز.

ئەوەی نكۆڵی لە ڕاستیەكانی مێژوو بكات نكۆڵی لە خودی خۆی دەكات. نـاتوانین لـە شـوورەیی مرۆڤایـەتی و شـەرمەزاری مـەزن رزگارمـان بـێ كـە نازیـەكان لێـی بەرپرسن. بـەڵام ئـەركی ئـەو ئەوانەیـە كـە نـاتوانن لـە بیریـان بكـەین، ئـەركی هەموو خێزانێكە و هەموو كەسێكە كە دەوێرێت ڕاستیەكان ببینـێ و پارێزگـاری لێ بكات و بۆ ئـەوەكانیتر بیانگوازێتـەوە و پاسـەوانیان بكـات تـا نەشـاردێنەوە و

دەستکاری نەکرێن، ئەمانی مێژوو و بەرەڵلایی وێرانی لە دوا دێت، ئێمە خۆمان بە ئاسانی هەڵدەخەڵتێنین کەوا ئەوەکەمان و سەردەمەکەمان دەتوانێ رێگا بە خراپەکاری و شێتی بگرێ. بوار بدەینە هزر رێبەری و دادمان بکات. هەموو کۆمەڵگەیەك بخوازێت رەگەزی هۆشیاری هەبێت ئەوەش هەڵوێستێکی ترسناك و ساختەیە. پێویستە هەموومان بوێرین بۆ هەموو کەسێك روون بکەینەوە کەوا کەس بێ گوێدان لە رەگەز و ئایین و تەمەن و رەگەز و کەلتوور... هتد بەهای چەسپاوی هەیە و نابێ پێشێل بکرێت. پێویستە ئەمانە لە ماڵ و جێشتخانە و شەقام و گۆڕەپانەکان و دیدارەکان باسیان لێوە بکەین و بە کردەوەش پاڵپشتی بکەین، تەنیا بە خەباتی هاوشان دژ بەو هەڵسوکەوتانە بوەستن کەوا درۆکان دەیانجوڵێنن، بەوە دەتوانین دارۆژ زامن بکەین.

ئەلف سڤنسون. پارتی دیموکراسی مەسیحی

ناونیشانی کتێبەکە لە کتێبی پیرۆز، یوئێل 1: 3،2 وەرگیراوە.
(( پیرەکان گوێ لەوە راگرن، ئەی دانیشتوانی هەموو زەوی سەرنج بدە، ئایا وەك ئەمە لە رۆژەکانتان یان لە رۆژەکانی باوکتان رووی داوە.
بە ئەوەکانتان بڵێنەوە و ئەوانیش با بە ئەوەکانی خۆیانی بڵێنەوە و بە ئەوەکانی ئەوەی تریش )).
ستیڤان بروشفیلد Stéphane Bruchfeld خوێندکاری دکتۆرا لە مێژووی هزر و توژینەوە لە مەڵبەندی توژینەوەی کۆچکردن Centrum för invandrings forskning لە زانکۆی ستۆکهۆلم ، لە بڵاوکراوەکانی ئەفرەت لە فرکردن، ناشیرنکردنی نازیەتی نوێ بۆ مێژووی پاش ئوشفیتز Förnekandet av förintelsen. Nynazistisk historie förfalskning efter Auschwitz.
بول.ئا.لیڤین Paul.A.Levine دکتور و توژینەوە، لە مەڵبەندی توژینەوەکانی فرە رەگەزکان Centrum för multietenisk forsking لە زانکۆی ئوپسالا. ئەندامی لیژنەی حکومی تایبەت بە سامانی جولەکە بە پلەی پسپۆر. بروانامەی بڵاوکراوەی هەیە لە ژێر ناونیشانی ( لە بەرەڵلایی تا هەڵوێستێکی

کاریگەر: دبلوماسیەتی سویدی و قڕکردن لە نێوان 1944ـ 1938دا ) From indifference to Activism: Swedish Diplomacy and the Holocaust 1938-1944.

2ـ مافی چاپ بۆ ستیڤان بروشفلید و پول لیفین و سەرۆکایەتی وەزیران پارێزراوە.

نەخشەسازی: ئەیلسا فولفارت Elsa Wohlfahrt

وێنەکان: سانا یوهانسون / بیلدریسورس/ Sanna Johansson/ Bildresurs

نوسینەوە: لینا ئەلین

وێنەی لاپەرەکانی 65،57،53،44،32،24، Jakob Wegelius

وەرگێڕانی بۆ سویدی: ئیڤا ئوکربیری Eva Åkerberg

ماریتا زونابند Marita Zonabend

ئەنیتا کارپ Anita Karp

میالوڤینجارت Mia Lõwengart

وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: Ayad Jabbar

وەرگێڕانی بۆ کوردی: Sherzad Heini

بەرهەمهێنان: Invandrartidningen

چاپ: چاپخانەی نورشتت ـ ستوکهۆلم Norstedts tryckeri 1999

لە سەر کاغەزی مونکن کریم چاپکراوە

ژمارەی جیهانی یەکگرتووی کتێب ....................

بڵاوکرانەوە: سەرۆکایەتی وەزیران / ستوکهۆلم

کتێبەکە لە دەست پێشخەری راگەیاندنی (( بەسەرهاتە زیندووەکان )).

لە ناوەرۆکی کتێبەکە نوسەرەکان بەرپرسن.

دەستەی کتێبە بەرنامەیەکانی دەزگای پەخشی ناتور نوك کولتور / یارمەتی پەخشی ئەم کتێبەی داوە.

